# چەند نامیلکەیەك



* حوكمی نوێژ نەكەر

* چونیەتی نوێژی نەخۆش و خۆپاك كردنەوەی

* پوختەی نوێژی پێغەمبەر ( صلى الله عليه و سلم )

* رێنموی موسلْمان بۆ چونیەتی نوێژ - دەست نوێژ - تەیەموم

نوسینی پایەبەرز: بن باز - شیخ محمد ناصرالدین الالبانی

وەرگێرانی:

الیاس - علی رائد - عطا محمد حمه سعید

٢٠٠٥

# پێشەکی

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيآت أعمالنا من يهدي الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد له ولياً مرشداً أما بعد فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد وشر الأمور محدثاتها وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار .

**خۆشەویستان ئەم نامیلکە خنجیلانەیەی کە بەرچاوتان دەکەوێت پوختەی چۆنیەتی نوێژو دەست نوێژو تەیەمومە ، ئەونوێژو دەستنوێژو تەیەممومەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری بەردەوام بووە و هاوەڵانی فێرکردووە و هانی داون لەسەر فێربوونی وەهەموو ئەو بابەتانەی کە لەم نامیلکەیەدا هەن هەمووی بە فەرموودەی ڕاست جێگیرن وە هەر ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کەوەری بگێڕمە سەرزمانی شیرینی کوردی چونکە تائێستا بەو پوختیە نامیلکەیەك یان پەڕاوێك دەرنەچووە کە بەو ڕاستی و ئاسانی و بەهێزیە بکۆڵێتەوە لەو سێ بابەتە گرنگە ، وەهیوا دارم ببێتە جێگای سودی موسڵمانان وە ئەو هەڵانەی کە لە نوێژەکانیاندا کردوویانە لەدوای بینین و خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە هەوڵبدەن ڕاستی بکەنەوە بەونوێژەی کە پێغەمبەر (ﷺ)کردوویەتی کە فەرموویەتی ((صلوا كما رأيتموني أصلي)) [1] .**

**واتە : نوێژ بکەن وەکو چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم ، وە ستنوێژەکانیشیان بەهەمان شێوە لەگەڵ تەیەممومەکانیاندا هەرهەڵەیەکیان تێدا کردبێت ڕاستی بکەنەوە ئیتر زانایی و دڵسۆزیتان مایەی خۆشحاڵیمە .**

وەرگێڕ

١٩٩٩/٨/١

---

(١) (رواه البخاري)

# نوێژ لەقورئانی پیرۆزدا

نوێژ لەئیسلامدا پلەوپایەو شوێن و جێگایەکی هەیە کە هیچ بەندایەتیەکی تر ئەو پلەو پایەو شوێن و جێگایەی نی یە ، کە کۆڵەکەی دینە وەکو چۆن لە فەرموودەی ڕاستدا هاتووە ، وە قورئانی پیرۆزیش لەزۆر جێگادا باسی دەکات بۆئاگادارکردنەوەی موسوڵمانان لەسەر گرنگی و هاندانیان لەسەر پارێزگاری لێکردنی لە نیشتە جێی و ڕێبواریدا ، لە ئاسایشی و ترسدا ، خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿ وأقيموا الصلاة وآتوا الزكاة وما تقدموا لأنفسكم من خير تجدوه عند الله إن الله بما تعملون بصير ﴾ (سورة البقرة : الآية / ١١٠) .

واتە : نوێژ بکەن و زەکات بدەن ، وەهەرچاکەیەك بکەن بۆخۆتان پاداشتەکەی لای خوای گەورە دەبیننەوە خوای گەورە بەوەی کە دەیکەن بەئاگاو بینایە .

وەدەفەرمووێ : ﴿ واستعينوا بالصبر والصلاة وإنها لكبيرة إلا على الخاشعين ﴾ (سورة البقرة : الآية / ٤٥) .

واتە : یارمەتی وەرگرن بەئارام گرتن و نوێژ کردن ، کە بەراستی ئەمە گەورەیە مەگەر لەسەر لەخوا ترسەکان نەبێت وە دەفەرموویت :﴿ حافظوا على الصلوات والصلاة الوسطى وقوموا لله قانتين ، فإن خفتم فرجالا أو ركبانا فإذا أمنتم فاذكروا الله كما علمكم مالم تكونوا تعلمون ﴾ (سورة البقرة : الآيتان / ٢٣٨-٢٣٩)

واتە : پارێزگاری لەنوێژەکان بکەن بەتایبەتی نوێژی عەسر وە بوەستن بۆخوا بەبێ دەنگی و ملکەچی یەوە ، خۆئەگەر لەکاتی ترسدابوون بە پیادە یان بەسواری نوێژەکان ئەنجام بدەن ، خۆئەگەر ترسەکە لاچوو یادی خوا بکەن (نوێژەکان بکەن ) وەکو چۆن فێری کردن کە لە پێشتردا نەتان دەزانی .

وەدەفەرمووێ ﴿ قد أفلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون ﴾ (سورة المؤمنون : الآيتان /١-٢) .

واتە : ئەو باوەڕدارانە سەرکەوتن ، ئەوانەی کە لەنوێژەکانیاندا مل کەچ بوون .

وەدەفەرموویت ﴿ والذين هم على صلواتهم يحافظون ، أولئك هم الوارثون الذين يرثون الفردوس هم فيها خالدون ﴾ (سورة المؤمنون : الآيات / ٩-١١)

واتە : وە ئەوکەسانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن ، بەڕاستی ئەوانە میراتگرن ، ئەوانەی فیردەوس (باخ و باخاتی بەهەشت ) بەدەست دەهێنن کە بۆهەتاهەتا یی و هەمیشەیی لەوێدان .

وەدەفەرموویت ﴿ قل أن صلاتي و نسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين ، لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين ﴾ (سورة الأنعام : الآيتان/ ١٦٢-١٦٣)

واتە : بڵێ نوێژەکەم و قوربانیەکەم و ژیان و مردنم هەمووی بۆ پەروەردگاری جیهانیانە ، کەهیچ هاوەڵێکی نی یە وە بەمە فەرمانم پێ کراوە وەمن یەکەمین کەسێکم کە خۆم بەدەستەوە داوە و لەموسوڵمانانم .

## نوێژ لەفەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ

بەهەمان شێوە دەبینین کە نوێژ لە زۆرفەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ)کە خەریکە لە ژماردن نایەن باس کراوە کەئەمەش بەڵگەیە لەسەر گرنگی و گەورەیی نوێژ ، وە چەند فەرموودەیەك لەو فەرموودانە دەخەینە ڕوو :پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ : (أول مايحسب عليه العبد يوم القيامة الصلاة ، فلن صلحت صلح سائر عمله ، وإن فسدت فسد سائر عمله) [1]

(١) (رواه الطبراني عن أنس بن مالك رضي الله عنه وهو حديث صحيح)

واتە : یەکەم شت کە بەندەلەڕۆژی قیامەتدا لەسەری دەپرسرێتەوە نوێژە ، خۆئەگەر بەچاکی ئەنجامی دابوو و سەرکەوت ئەوا هەموو کردارەکانی تری چاك دەبێت ، خۆ ئەگەر بەخراپی ئەنجامی دابوو ئەوا کردارەکانی تریشی خراپ دەبێت .

* (بين الرجل وبين الكفر ترك الصلاة) [1].

واتە : لەنێوان پیاوێك و نێوان بێ باوەڕی واز لە نوێژ هێنانە

* (العهد الذي بيننا وبينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر) [2].

واتە : ئەو پەیمانەی کە لەنێوانی ئێمەو ئەواندا یە نوێژە هەرکەسێك وازی لێبهێنێت بێباوەڕدەبێت .

* (أرأيتم لو أن نهرا بباب أحدكم يغتسل منه كل يوم خمس مرات هل يبقى من درنه شيء ؟ قالوا لايبقى من درنه شيء ، قال فذلك مثل الصلوات الخمس يمحو الله بهن الخطايا) [3].

واتە : پێم بڵێن ئەگەر ڕوبارێك بەبەردەمی ماڵی یەکێکتاندا بڕوات ، هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێبشوات ئایا هیچ چڵکی و پیسیەکی پێوە دەمێنێت ؟ وتیان : هیچ چڵك و پیسیەکی پێوە نامێنێت ، فەرمووی دەئەمە وەکو نوێژە فەرزەکان وەهایە کە خوای گەورە گوناهی پێدەکوژێنێتەوە .

*(من صلى البردين دخل الجنة) [4].

واتە : هەرکەسێك نوێژی بەیانی و عەسر بکات دەچێتە بەهەشتەوە .

---

(١) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي وابن ماجة عن جابر ﷺ)
(٢) (رواه أصحاب السنن عن بريدة ﷺ)
(٣) (رواه البخاري ومسلم عن أبي هريرة ﷺ)
(٤) (رواه البخاري ومسلم عن أبي موسى الأشعري ﷺ)

# پاك و خاوینی

ئیسلام هانی پاك و خاوینی موسولمانی داوە لەگشت کاتیکدا ، وە زیاتر هانی داوە لەسەری لەکاتی نویژدا ، بەوەی کە پاك و خاوینی کردووە بەمەرجیك بۆ نویژەکەی .

وە پاك و خاوینی ئەمانە دەگریتەوە :

*پاك وخاوینی پۆشاك : شیاو نی یە نویژکردن بە پۆشاکی پیسەوە واجبە کە بیشۆیت یان بیگۆریت .

*پاك وخاوینی شوین : واجبە ئەو شوینە هەلبژیریت بۆ نویژکە دوورە لەپیسی .

پاك وخاوینی لاشە کە دووجۆرە :

١) پاك وخاوینی لاشەلەو پیسیانەی کە پیوە ی نوساوە .

٢) پاك و خاوینی مەعنەوی لاشە وە ئەمە خۆشۆر (غوسل) یان دەستنویژ دەگریتەوە وەلە بابەتەکانی داهاتوودا زیاتر روونی دەکەینەوە .

**چۆنیەتی دەستنویژ :-**

خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿ یا أیها الذین آمنوا إذا قمتم إلى الصلاة فاغسلوا وجوهكم وأیدیكم إلى المرافق و ا مسحوا برؤسكم وأرجلكم إلى الكعبین ﴾ (سورة المائدة : الآیة /٦)

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەرتان هیناوە کاتیك کە هەستان بۆ نویژ دەم و چاوتان بشۆن وە دەستان هەتا ئانیشکتان وە مەسحی سەرتان بکەن و قاچتان بشۆن هەتا قولە پێ ، بە پێی ئەمە دەشتنویژ فەرزە ، نویژ دروست نی یە بە بێ گرتنی ، وەواجبە لە سەرمسولمان جێ بەجێ کردنی بۆئەوەی کە نویژەکەی دروست بیت ، سەبارەت بە چۆنیەتیەکەشی بەم جۆرە دەبیت :



* نیەتی دەست نوێژ دەهێنم ، وە نیەت شوێنەکەی دڵە وە بەدەم دەری نابڕم ، بەڵکو ئەوندە بەسە کە بەدڵ ئاگام لێیە کە دەستنوێژ دەگرم و جێبەجێی دەکەم .



* ئینجا دەڵێم (بسم الله ) و هەردو لە پی دەستم دەشۆرم سێجار کە ئەمە سوننەتە .



* ئینجا ئاو لە دەمم وە ردەدەم وە غەرغەرەی پێ دەکەم مەگەر بەڕۆژوو بم ئەوکاتە ئاو لەدەمم وەردەدەم بەلاّم غەرغەرەی پێناکەم ، ئینجا ئاو لەلوتم وەردەدەم وە هەڵی دەمژم هەتا باریکایی لوتم ئینجا (هن) دەکەم و ئاوەکە دەکەمەوەدەرەوە لەلوتم وە ئەمەددکەم بەیەك ئاولەپ سێ جار .



* وەئاو لەلوت وەردان بەدەستی ڕاست دەبێت وە ئاو دەرکردنەوە لەلوت بەدەستی چەپ دەبێت .



* ئینجا دەم وچاورم دەشۆرم سێ جار ، کە بریتیە لە شوێنی ڕوانی موەکانی سەرەوە تا کۆتایی چەناکە وە نێوانی هەردوو گوێچکە .

** ** ** ** ** ** ** ** ** ** ** ** ** **



* ئينجا هەردوو دەستم دەشۆرم هەتا ئانيشكم ، لە پێشدا لە دەستی ڕاستمەوە دەست پێدەکەم سێجار .



- ئينجا مەسحی سەرم دەکەم بەهەردوودەستم دەيبەم بۆدواوە و دەيهێنمەوە بۆپێشەوە ، لە پێشدا لەپێشی سەرمەوە دەست پێدەکەم هەتا پشتی سەرم ئينجا دەيهێنمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێيەوە دەستم پێکرد کە پێشی سەرمە ، ئينجا هەردوو پەنجەی شايەتمانم دەخەمە ناو گوێم و بەهەردوو پەنجەگەورەم دەرەوەی (پشتی) گوێچکەم مەسح دەکەم وە ئاوی بۆتازە ناکەمەوە بەڵکوهەربەوئاوەی کە مەسحی سەرم پێکردووە مەسحيان دەکەم .

******* ***** *** ***** *** *******



* ئینجا هەردوو پێم دەشۆم هەتا قولە پێم ، لەقاچی ڕاستمەوە دەست پێدەکەم ئینجا چەپ .

* ئینجا دەلێم ئەگەر ئارەزووم لێ بوو : (أشهد أن لاإلــه إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبد ه ورسوله ، اللهم اجعلني مــن التوابين واجعلني من المتطهرين ).

* یان ئەلێم ((سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لاإله إلا انـــت أستغفرك وأتوب إليك))

* وەبەمە دەستنوێژەکەم کۆتایی دێنم وەخوای گەورە و پاك و بێگەرد لەخۆم ڕازی دەکەم .

## لەو شتانەی کە دەستنوێژ دەشکێنن :

* هەموو شتێك کە لە دووریگاکەوە دەربچێت (پێش و دواوە)

* خەوتن .

*بێهۆش بوون و لەسەرخۆچوون .

## لەو شتانەی کە دەسنوێژ ناشکێنن :

*دەست بەر ئافرەت کەوتن (١) (لەبەر ئەو دوو فەرموودەیەی کە جێگیرن لە سوننەتدا لە عوروەی کوری

زوبەیرەوە ئەویش لە عائیشەوە کە دەفەرمووێ : پێغەمبەر (ﷺ) ماچی هەندێ لە خیزانەکانی کرد وە چوو بۆنوێژ و دەستنوێژیشی نەگرتەوە . ئەبو دادود گێراویەتەوە بەژمارەی (١٧) وە ئیبن ماجە بەژمارەی (٥٠٢) وە ئەلبانیش بە فەرمووودەیەکی راستی لە قەلەم داوە ) رەحمەتی خوای لێبێت ) . وە ئەوفەرموودەیەی کە هەرعائیشە دەیگێڕیتەوە کە دەفەرمووێ : من دەنوستم لەبەردەم پێغەمبەردا (ﷺ) وەقاچم لەبەردەم رووگەکەیدا بوو کاتێك کە دەیویست سوجدەببات بەدەستی قاچمی لادەبرد . (متفق علیە) . وە ئایەتی﴿ أولمستم النساء ﴾ ئیبنو عەباس دەفەرمووێ ئەوە کۆبونەوەیە لەگەل ئافرەتدا وە ئیبن کەپیریش ئەمی هەلبژاردووە .(رەرگی) .

* دەرچونی خوێن .

## لەشتە مەکروهەکانی دەستنوێژ :

* زیادەرەوی کردن لە ئاودا .
* ئاودان بەدەم و چاودا .

## لەو شتانەی کە موستەحبە دەستنوێژیان بۆ بگیرێتەوە

* دەستنوێژ گرتن لەکاتی هەموو دەستنوێژشکانیکدا.
* دەستنوێژ گرتن لەدوای رشانەوە .
* دەستنوێژگرتن لەدوای هەلگرتنی مردوو .

## تەیەممـــوم

* تەیەممومم مەشروعە چونکە خوای گورە دەفەرموێ :
﴿ وإن كنتم جنبا فاطهروا وإن كنتم مرضى أو على سفر أو جاء أحد منكم من الغائط أو لمستم النساء فلم تجدوا ماءا فتيمموا صعيدا طيبا فامسحوا بوجوهكم وايديكم منه مايريد الله ليجعل عليكم من حرج ولكن يريد ليطهركم وليتم نعمته عليكم ولعلكم تشكرون ﴾ (سورة المائدة / ٦) .

واتـه : ئەگـەر توشـی لـەش گرانـی هـاتن خۆتـان خـاوین بکەنەوە ، وەئەگەر نەخۆش بوون یان دەست نوێژتـان شـکا یـان لەگـەڵ ئـافرەت کۆبوونـەوە و ئاوتـان دەسـت نەکـەوت تەیەمموم بکەن بە خۆلیکی پاك یـان شتیك کەلەسـەر رووی زەوی بەرز بوو بێتەوە دەم و چاوتان و هەردوو دەستان مەسح بکەن ، خوای گـەورە نایـەوێت کەئێوە تووشـی نارەحـەتی ببن بەڵکو ئەیەوێت کەپاکتان بکاتەوە وەنیعمەتەکانی خۆیتان بۆ تەواو بکات بۆ ئەوەی شوکرانە بژێرو سوپاس گوزاری بن .

* وە تەیـــەمموم تایبەتمەندیەکـــە کـــەخوای گـــەورە بەخشیویەتی بەم ئوممەتە وەکو بەزەییەك و گەورەییەك بۆی .

وەە تەیـەمموم شـیاوە بـۆ کەسـێك کـە بـێ دەسـتنوێژی بچوکی هەبێت یان گەورە (لەش گرانی ) ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت . وەتەیەمموم بەخۆڵ و هەموو شتێك کە خودی زەوی بێت دەکرێت بۆنمونە وەکو لم .

چۆنیەتی تەیەمموم ١-



- نییەتی تەیەمموم دەهێنم .

- بسم الله دەکەم.



-ئینجا هەردوو دەستم دەکیشم بە خۆڵە پاکەکەدا .



-ئینجا فو لەهەردوو دەستم دەکەم .



ــئینجا دەم و چاوم و هەردوو دەستمی پێ مەس .

***** *** ***** *** ***** *** ******

## مەرجەکانی نوێژ

بۆنوێژ چەند مەرجێك هەیە:

🡐پاك و خاوێنی بـۆ لاشـەو شـوێنەکەی کـە نوێژەکـەی تیادەکرێت .

🡐هاتنی کاتەکە .

🡐داپۆشینیعەورەت .

وە پێویسـتە لەسـەر ئـافرەت نوێـژ دور لـەچاوی پیـاوانی نامەحرەمەوە بکات .

🡐روکردنە رووگە (قیبلە) کە ئەمە پایەیە کە لەپاییەکانی نوێژ کە نوێژدروست نی یە بێکردنی .

## چۆنیتی کردنی نوێژ :-



✳ بەرامبەر بەرروگە دەوەستم ، ئینجا نیەت لە دلما دەهێنم ئەو نوێژەی کە ئەمەویت وە بەزمان دەری نابرم.

✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳

✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳



✳ ئینجا نوێژەکەم دادەبەستم بە ووتنی ((الله أكبر)) وە ئەمە تەکبیری ئیحرامی پێ دەوترێت وە یەکێکە لە پایەکانی نوێژ .ئینجا هەردوو دەستم بەرز دەکەمەوە و پەنجەکانم بلاو ناکەمەوە وە لەپی دەستم لەئاستی شانم و سەری پەنجەم لەئاستی گوێچکە کانم دادەنێم ، وە دەستم نادەم لەنەرمایی گوێچکەکانم چونکە ئەربەلگانەی لەسەری هاتوون راست نین .



✳ دەستی راستم لەسەر دەستی چەپم دادەنێم و لەسەر سنگما دەیگرم ، وەگرتنی دەست لە بیجگە لەسەرسنگدا فەرموودەییەکی راستی لەسەر نەهاتووە لەلایەن پێغەمبەرەوە (ﷺ) .

⁂ وە بەدلم ناکام لەزمانم دەبێت کە چی دەڵێم چونکە من بە بەردەمی پەروەر دگاری ئاسمانەکان وزەویدا وەستاوم ، وە لەکاتی وە ستانمدا سەیری شوێنی سوجدەکەم دەکەم، وە ئاوڕنادەمەوە بەلای راست و چەپمدا .

⁂ لەدوای ((الله أكبر)) ی نوێژ دابەستن دوعای کردنەوە (إستفتاح) ی نوێژ دەخوێنم ووە دەڵێم ((اللهم باعد بيني وبين خطاياي كما باعدت بين المشرق والمغرب ، اللهم نقني من خطاياي كما ينقي الثوب الأبيض من الدنس ، اللهم اغسلني من خطاياي بالماء والثلج والبرد )) یان جگە لە مە کە لە سوننەتدا هاتووە و واریدە .

⁂ ئینجا دەست بەخوێندنی قورئان دەکەم و دەڵێم (( أعوذ بالله من الشيطان الرجيم )) کە ئەمە واجبە ،ئینجا سورەتی فاتیحە دەخوێنم کە ئەمەش پایەیەکە لە پایەکانی نوێژ:
﴿بسم الله الرحمن الرحيم * الحمد لله رب العالمين * الرحمن الرحيم * ملك يوم الدين * إياك نعبد و اياك نستعين * إهدنا الصراط المستقيم * صراط الذين انعمت عليهم * غير المغضوب عليهم ولا الضالين ﴾ .

⁂ وە سورەتی فاتیحە بەلەسەرخۆیی دەخوێنم وپەلە ناکەم ، ئایەت بە ئایەت دەوەستم ، لەسەری هەموو ئایەتەکاندا دەوەستم ، وەکو چۆن پێغەمبەر (ﷺ)ئاوای دەکرد کە قورئانی دەخوێند .

⁂ وەسوننەتە لەدوای تەواوبونی فاتیحە بڵێین {آمين}واتەخوایە لیمان وەرگرە .

⁂ وە سوننەتە کە لە دوایەوە سورەتێکی کورت بخوێنم ، وەکو ﴿ قل هو الله أحد * الله الصمد * لم يلد ولم يولد * ولم يكن له كفوا احد * ﴾

یان جگەلەمەچی‌ئارەزوم لی‌یەلەقورئان دەیخوینم کاتیکیش کە تەواو بوم لە خویندنی قورئانەکە تۆزیک دەوەستم هەناسەیەك دەدەم .



✻ ئینجا هەردوو دەستم بەرز دەکەمەوە و ((الله أکـــبر )) دەکەم وەکو چۆن لەکاتی نویژ دابەستندا کردم وەئەمەواجبە .



✻ ئینجا رکوع دەبەم هەتا ئەوکاتەی کە دەمینمەوە تیایدا وە هەموو ئیسقانەکانم شوینی خۆیان دەگرن وە ئەمەش پایەکانی نویژ .

✻ وەلەپی دەستم دەخەمە سەرئەژنۆم و پەنجەکانی دەستم بلاو دەکەمەوە ، وەکو ئەوەوابیت کە ئەژنۆم گرتووە ،

وەپشتم دریژ دەکەم و راست دەیوەستینم ، وە سەرم لەبەرز دەکەمەوەو نەنزمی دەکەمەوە ، بەلکو یەکسانی دەکەم لەئاستی پشتمدا ، وە ئانیشکم دور دەخەمەوە لە تەنیشتەکانم .

وە لە رکوعەکەمدا دەلیم ((سبحان ربي العظيم )) سێ جار یان زۆرتر لەمە .

✳ ئینجا هەلدەستمەوە لە رکوع و راست دەبمەوە و دەلیم ((سمع الله لمن حمدة ، ربنالك الحمد )) وەمەش پایەیەکە ، وەدەستم بەرز دەکەمەوە لەکاتی راست بونەوەمدا لە سەر شیوەکەی پیشو وە دمینمەوە لە وەستانەکەمدا .

✳ ئینجا دەلیم : (( الله أكبر )) کەئەمە واجبە ، وە دەستم بەرز دەکەمەوە هەندێ جار .





✳ ئینجا سوجدە دەبەم (کەئەمە پایەیەکە ) وە لەکاتی چونم بۆسوجدە دا دەستم پیش ئەژنۆم دادەنیم .

✳ وە لوتم و دەم وچاوم لەزەوی دەچەسپینم ، وە قاچیشم بە هەمان شیوە وە پەنجە کانی قاچم رور دەکەمە رووگە وهەردووکیان جووت دەکەم .

✳✳✳ ✳✳✳ ✳✳✳ ✳✳✳



✵ ئینجا هەردوو لەپی دەستم لە سەر زەوی دادەنێنم و پەنجە کانی دەستم بلاو ناکەمەوە وە هەردوو لەپی دەستم نزیك دەکەمەوە لە گوێچکەم یان شانم وە هەردوو ئانیشکم لە زەوی بەرز دەکەمەوە .

✵ وە لە سوجدەکەمدا دەڵیم ((سبحان ربي الأعلى )) سێ‌جار یان زیاتر لەمە ، وە بەوپارانەوەیەی کە ئەمەوێ دەپاڕیمەوە چونکە نزیك ترین کاتێك کە بەندە نزیکە لە پەروەردگاریەوە لەکاتی سوجدەدایە .

✵ ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵیم ((الله أكبر)) کە ئەمەش واجبە ، وە دادەنیشم لە نێوانی دووسوجدەکەدا وە دەمینمەوە تیایدا وە قاچی چەپم رادەخەم و لەسەری دادەنیشم ، وەقاچی راستم دەچەقێنم لە زەوی و دەڵیم ((رب أغفر لي ، رب أغفر لي ))

✵ ئینجا ((الله أكبر)) دەکەم و سوجدەی دووەم دەبەم وە چیم کرد لە سوجدەی یەکەمدا واش دەکەمەوە لە سوجدەی دووەمدا .

✵ ئینجا سەرم بەرز دەکەمەوە و دەڵیم ((الله أكبر)) کە ئەمە واجبە – وە هەندێ جار دەستیشم بەرز دەکەمەوە – وە لیرەدا ( جەلسەی ئیستراحە ) دەکەم کە کەمیك دادەنیشم پیش ئەوەی کە هەستمەوە وە بۆ رکاتی دووەم ئینجا

دەستم وەکو چۆن هەویر دەشیلرێت .

✻ ئینجا چیم کرد لە رکاتی یەکەمدا ئاوەهاش دەکەم، لەرکاتی دووەمدا ئەوەندەبێت کە دوعای کردنەوەی نوێژ ناخوێنم .

✻ وەلە دوای لێبونەوە لەرکاتی دووەم ، دادەنیشم بۆ تەحیات بە و شێوە یەی کە لە نێوانی دووسوجدەکەدا دادەنیشتم کە ئەمەش واجبە ، وە لەپێ دەستم دەخەمە سەرران و ئەژنۆی راستم ، وە ئانیشکم دەکەمە سەر رانم بەم شێوەیە ، وە دەستی چەپم دەخەمە سەر ران و ئەژنۆی چەپم .



✻ ئینجا پەنجە کانی دەستی راستم هەمووی دەقونجێنم بێجگە لە پەنجە گەورەم کە لەسەر پەنجەی ناوە راستم دای دەنێم وە پەنجەی شایەتومانم رو دەکەمە رووگە وە سەیری ئەم پەنجە یەم دەکەم ، وە دەیجولێنم و پیێ دە پاڕێمەوە لەسەرەتای تەحیاتەوە تاکۆتایی لێدەبمەوە . وەلە تەحیاتەکەمدا دەلێم (( التحيات لله ، والصلوات ، والطيبات ، السلام على النبي ورحمة الله وبركاته السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين ، أشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله )) ئینجا سلاوات لە سەر پێغەمبەر (ﷺ)دەدەم و

دەلیم (( اللهم صل علی محمد وعلی ال محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم ، إنك حميد مجيد ، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد )) .

✻ ئینجا دەپاریمەوە بەو پارانەوانەی کەلە سوننەتدا هاتوون ئەوەی کە دەمەویت ، وە لەوانە (( **اللهم آتنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار** ))

✻ ئینجا ئەگەر ویستم هەستمەوە بۆ رکاتی سێیەم ((الله أكبر)) دەكەم هەر بە دانیشتووی‌کە ئەمەش واجبە — وە دەستیشم بەرز دەکەمەوە هەندێجار – . وە لەرکاتی سێیەم و چوارەم دا فاتیحە دەخوینم کەواجبە .



✻ ئینجا لە رکاتی چوارەمدا بۆتەحیاتی دووەم دادەنیشم وە چیم کرد لە تەحیاتی یەکەمدا وادەکەمەوە ئەوەندە نەبیت کە قاچی چەپم دەبەمە دەرەوە و لەسەر سمتی چەپم دادەنیشم و قاچی راستیشم دە چەقینم .

✻ وە لەدوای تەواو بوون لە تەحیات و سلاوات لەسەر پیغەمبەر (ﷺ) پەنا بەخودا دەگرم لە چوار شت کە دەلیم : (( اللهم إني أعوذبك من عذاب جهنم ومن عذاب القبر ومن فتنة المحيا والممات ومن شر فتنة المسيح الدجال )) .

✻ ئینجا بەچی بمەوێ دەپاریمەوە وە چاکترواپە کە لە قورئان و سوننەتدا بیت .



✳ ئینجا سەلامی لای راست دەدەمەوە کە ئەمە پایەیەکە هەتا ئەو کاتەی کە سپیایی رومەتی راستم ببینرێ ، کە دەلیم (( السلام علیکم ورحمة الله وبرکاتـــه )) ئینجا سەلامی لای چەپ دەدەمەوە و دەلیم (( السلام علیکم ورحمة الله ))

✳ وە بەمە نویـژە کـەم تـەواو دەکـەم و لـە نویــژە کـەم دەبمەوە وە فەرزەکەم بە جێهینا و خوای خۆشم رازی کرد .

## پینج نویژە فەرزەکە :-

بزانە برای موسولمانم کە خوای گەورە پینج نویـژی فـەرز کـردووە لەسـەرمان سـیفەت و ژمـارەی رکاتـەکانیان وەك یـەك نی‌یە ، کە ئەوانیش : نویژی بەیانی ، نویژی نیوەرۆ ، نویـژی عەسـر ، وە نویــژی مــەغریب (ئیــوارە) ، وە نویــژی عیشــا (خەوتنان) خۆ ئەگەر ویستت بیکەی :

***نویژی بەیانی :***

دوو رکات دەکەیت بەو شیوەیەی کە باسمان کرد ، دەنگت بەرز دەکەیتەوە ، بەلاّم لەجیاتی ئـەوەی کـە هەسـتیتەوە بـۆ رکاتی سییەم سەلامی لای راست و لای چەپ دەدەیتەوە .

✳ ✳ ✳

✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳ ✳



*نویژ نیوەڕۆ :*

چوار ركات دەكـەیت لەسـەر ئەوەیكـە باسمـان كـرد ، ئـەوەندە هەیـە كـە دەنگـت بـەرز ناكەیتـەوە لـە دوو ركـاتی یەكەمدا

*نویژی عەسر :*

نوێژی عەسر هەروەكو نوێژی نیوەڕۆ وایە .

*نویژی مەغریب (ئیوارە) :*

سێ ركات دەكەیت و لە دوو ركاتی یەكەمدا دەنگت بەرز دەكەیتـەوە ، ئینجـا لـە ركـاتی سـێیەمد ا چـی لـە ركـاتی چوارەمـدا دەكـەیت لەمیشـدا دەیكـەیت و سـەلام دەدەیتـەوە (واتـە وەكـو نوێـژی نیـوەڕۆ چیمـان كـرد لـە ركـاتی چوارەمـدا بەڵام نوێژی مەغریب ركاتی چوارەمی نییە) .

*نویژی عیشا :*

چوار ركـات دەكـەیت وە دەنگـت بـەرز دەكەیتـەوە لـە دوو ركاتی یەكەمدا .

**پینج نویژە فەرزەكە :-**

بزانـە بـرای موسلمانم كە خـوای گـەورە پێنج نوێـژی فـەرز كردووە لەسەرمان سیقەت و ژمارەی ركاتەكانیان یەك نی یە ، كە ئـەوانیش نوێـژی بەیانیـە ، وە نوێـژی نیـوەڕۆ ، وە نوێـژی عەسـر ، وە نوێـژی مـەغریب ، وە نوێـژی عیشـا . خۆنەگـەر وریستت بیكەی :

*نویژی بەیانی :*

● دووركات دەكـەیت بـەو شـێوەیەی كـە باسمـان كـرد دەنگت بەرزدەكەیتەوە بەلام لـەجیاتی ئـەوەی كـە هەستیتەوە بۆركاتی سیهەم سەلامی لای راست و لای چەپت دەدەیتەوە .

• **نوێژی نیوەڕۆ :**

چواررکـات دەکـەیت لەسـەر ئەوەی کـە باسمـان کـرد ، ئەوەندە هەیە کە دەنگت بەرزناکەیتەوە لەدوورکاتی یەکەمدا .

• **نوێژی عەسر :**

نوێژی عەسر هەروەکو نوێژی نیوەڕۆ وایە .

• **نوێژی مەغریب :**

سـێ‌ڕکات دەکـەیت و لـەرکاتی یەکـەمدا دەنگـت بەرزدەکەیتەوە ، ئینجا لە ڕکاتی سێ‌هەمدا چـی لـە ڕکـاتی چوارەمدا دەکەیت لەمیشدا دەکەیت و سەلام دەدەیتەوە .

• **نوێژی عیشا :**

چـوار ڕکـات دەکـەیت و دەنگت بەرز دەکەیتـەوە لـە دوو ڕکاتی یەکەمدا .

| کاتەکان | سوننەتی پێش نوێژ | فەرز | سوننەتی دوای نوێژ | وەتر |
|---|---|---|---|---|
| بەیانی | ٢ | ٢ | – | – |
| نیوەڕۆ | ٤ | ٤ | ٤ | – |
| عەسر | ٤ | ٤ | – | – |
| مەغریب | ٢ | ٣ | ٢ | – |
| عیشا | ٢ | ٤ | ٢ | – |

✳✳✳ ✳✳✳ ✳✳✳

## چەند ئامۆژگاریەکی تریش :-

• پارگاری لە نوێژی جەماعەت بکە لەمزگەوتدا ، وە دلسۆزیە لەکاتی بانگداندا .

• سوربە لەسەر سیواك کردن چونکە رازی بوونی خوای تیدایە و ناوەدەمیش خاوێن دەکاتەوە (وەکو چۆن لەو فەرموودە راستەدا هاتووە )

• پاریزگاری لە زیکرەکانی دوای نوێژە فەرزەکان بکە ، وە لە زیکرەکانی بەیانی و ئیوارانیش .

• ئەگەر گوێچت لە بانگ بوو وەلامی بدەرەوە ، وەواز لە قسەکردن بهێنە لەگەل کەسانی تردا .

• زۆر بپاریرەوە لییان لە رۆژی هەینیدا .

• کاتیك کە چویتە مزگەوتەوە بلێ (( بسم الله والصلاه والسلام علی رسول الله )) وە کە چویشیتە دەرەوە بەهەمان شیوە .

• مە هیلە هیچ کە سیك بەبەردەمتدا بروات کە نوێژت کرد خۆئەگەر هەر رۆی بیگیرەرەوە ، وەلەبەردەمتدا بەربەستیك دابنێ .

• پیش ئیمام مەکەوە لەنوێژدا .

• ئەوەی کە دەیزانی سەبارەت بە نوێژ کەسانی تریشی پێ فیربکە ، وە چۆنییتی راست تێبگەیەنە وەکو چۆن فیربووی .

ئەگەر هەلیەکتان بینی بۆمان بپۆشن

ئەو خوایە بێهەلەیە کە هەردەم بەرزو بلندە .

# پوختەی
# چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر

((صلى الله عليه وسلم))

**نووسینی**

الشيخ محمد ناصرالدين الألباني

**وەرگێڕانی**

علی رائد

چاپی یەکەم

١٤٢٢ کۆچی




((صلوا كما رأيتموني أصلي))

رواه: (البخاري واحمد)

بسم الله الرحمن الرحيم

ان الحمد لله نحمده و نستعينه و نستغفره و نعوذ بالله من شرور انفسنا و من سيئات اعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، و اشهد ان لااله الا الله، وحده لاشريك له و اشهد ان محمدا عبده ورسوله.

اما بعد..

برای بەڕێزم (زوهیر الشاویش) خاوەنی (المكتب الاسلامي) پێشنیاری ئەوەی كرد، كە هەڵسم بە كورت كردنەوەی كتێبەكەم (صفة صلاة النبي (ﷺ) من التكبير الى التسليم كانك تراه) وە پوختی بكەم و دەستەواژەكانی ئاسان و سووك بكەمەوە بۆ عامی خەڵكی.

كاتێك بینیم پێشنیارێكی پیرۆزە، رێك بوو لەگەڵ ئەوەی لە خایاڵم دابوو،وە چەندین جاری تر لە چەند برایەك و هاوڕێیەك ئەم پێشنیارەم بیستووە، ئەمەش هانی دام كە بەشێك لە كاتە سەرقاڵەكانم بە كاری عیلمی ببڕم بۆی.

داواكارم لە پەروەردگار بە نیاز پاكی و ئیخلاصی وەریبگریٚ وە سوودمەند بێت بۆ موسڵمانان.

وە هەندیٚ سوودی ترم بۆی زیاد كردووە كە لە درێژەكەدا نییە كە لە كاتی كورت كردنەوەكەدا بە چاكم زانی بۆی زیاد بكەم.

هەروەها گرنگیم داوە گرنگییەکی تایبەتی بە راقە کردن و شەرح کردنی هەندێ لە ووشە و زاراوەکان کە لە فەرموودە و ویردەکاندا هاتوون.

هەروەها سەرباسی سەرەکیم بۆی داناوە، هەرودها هەندێکی تری لاوەکی بۆ روونکردنەوەی زیاتر، هەروەها لە تەنیشت هەر باسێکەوە حوکمی شتەکەم دیاری کردووە کە روکنە یا واجبە، وە ئەوەی لێی بێ دەنگ بوومە، ئەوە لە سوننەتەکانە.

* (روکن) ئەو شتەی لە ناویدایە بەوە تەواو دەبێت، وە نەبوونی نیشانەی بەتاڵی ئەو شتەیە کە تیایدا روکنە وەك چەمینەوە (رکوع) لە نوێژدا، تیایدا روکنە ئەگەر نەبێت، نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

* مەرج (شرط)یش: وەك روکن وایە، بەلام لە دەرەوەی ئەو شتەیە کە تیایدا مەرجە، وەك دەست نوێژ لە نوێژدا، کە بە بێ ئەو دانامەزرێت.

* وە واجب، ئەوەیە کە بە دەقی قورئان و سوننە فەرمان پێ کردنی سەلمێنراوە، وەهیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر بوونی بە (روکن) یا (مەرج) وە ئەنجام دەری پاداشت وەردەگرێتەوە، واز لێ هێنەریشی، سزا دەدرێتەوە مەگەر عوزر و بیانوێکی شەرعی هەبێت.

* وە سوونەت: ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامی داوە لە عیبادەتەکان بە بەردەوامی یان زۆربەی جار، وە فەرمانی پێ نەکردووە بە واجبێتی. وە بکەری پاداشت وەردەگرێتەوە وە واز لێ هێنەری سزا نادرێت.

وە هەرچی ئەو فەرموودەیە کە موقەلیدەکان باسی دەکەن و دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) کە گوایە فەرموویەتی: ((من ترك سنتي لم تنله شفاعتي)).

واتە: هەر کەسێك واز لە سوننەتی من بهێنێت، شەفاعەتی منی بەر ناکەوێت، ئەمە ئەسڵی نییە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ)[1] وە هەر شتێك وا بوو دروست نییە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەك ببێتە قسە هەڵبەستن بۆی چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((من تقول علي ما لم اقل فليتبوا مقعده من النار)) واتە: هەر کەسێ لە خۆیەوە قسەیەك بکات وبیداتە پاڵ من ئەوا با جێگەی خۆی لە دۆزەخ خۆش بکات.

وە چاکە بووترێ، کە لەم نوسراوەمدا لەسەر هیچ مەزهەبێکی دیاری کراو لە (چوار مەزهەبەکە) نەڕۆیشتم، بەڵکو لەسەر ڕێبازی ئەهلی حەدیس ڕۆیشتووم ئەوانەی پەیوەستن بە کار کردن بە هەر فەرموودەیەك جێگیر بووبێت

---

(١) واتە هەر فەرموودە نییە.

لــه پێغەمبــەر (ﷺ) بۆیــه مەزهــەبی ئــەوان لــه هــەموو مەزهەبـەکانی تـر بـەهێز تـره، وەك حــەق ویسـتان دان بـەم راستییەدا دەنێن له کتێبەکانیان، وەك (العلامة ابو الحسان الکنوي الحنفي) دەڵێت: چۆن وا نـەبێت لـه کـاتێکدا ئـەوان مــیراتگری راســتەقینەی پێغەمبــەرن (ﷺ) وه نوێنــەری راسـتگۆی شــەرعەکەی ئــەون، خودالــه کۆمــەڵی ئــەوان حەشــرمان بکــات، وه لەســـەر خۆشەویســتی ئــەران بمانمرێنێت.

رەحمەتی خوا لـه ئیمامی (ئەحمەدی کـوڕی حەنبـەل) بێت که دەڵیت:

دیــن النــبي محمــد اخبــار
نعــم المطيــة للمفتــى اثــار
لا ترغـبن عــن الحديــث واهلــه
فــالراي ليــل و الحديــث نــهار
ولربما جـهل الفتـى اثـر الهـدى
و الشــمس بازغــة لهــا انــوار

محمد ناصر الدين الالباني
دمشق ٢٦ صفر ١٣٩٢

## یەکەم: رووکردنە لە کەعبە
### (استقبال الكعبة)

١- ئەی موسڵمان ئەگەر هەڵسای بۆ نوێژ کردن، ئەوا روو بکە کەعبە لە هەر کوێیەك بوویت، لە فەرز و سوننەتدا، وە ئەمە روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ کە بە بێ ئەو دروست نییە.

٢- روو کردنە کەعبە لەسەر شەڕکەر و جەنگاودر نامێنێ لە نوێژی ترس (صلاة الخوف) وە لە کوشتارێکی قورس

- وە لەسەر ئەو کەسەی ناتوانێ بە جێی بگەیەنێ وەك نەخۆش، یان وەك ئەو کەسەی لە ئوتمبێل دایە یان لە کەشتی یان لە فڕۆکەدایە ئەگەر ترسی ئەوەی هەبوو کاتەکەی نوێژ نەمێنێت.
- وە لەسەر ئەو کەسەی سوننەت یان وتر دەکات لەسەر پشتی سوارێکەوە، وا باشە (مستحب)ە بۆی ئەگەر لە توانایدا بوو، لە کاتی (الله اکبر) کردنەکەدا (الاحرام) رووی بکاتە کەعبە، پاشان روو بکاتە ئەو لایەی کە بۆی دەڕوات.

## حوکمی نوێژ کردن رووەو غەیری کەعبە :

٣- وە ئەگەر نوێژی کرد بۆ غەیری رووەو کەعبە لەبەر تەم و مژ و وێنەی ئەمانە لە دوای ئیجتهاد کردن و هەوڵدان

بە تەواوەتی بۆ دۆزینەوەی ئەوا نوێژەکەی دروستە و دووبارە کردنەوەی لەسەر نییە.

٤- وە ئەگەر یەکێك کە متمانەی پێ هەبوو ئەویش لە ناو نوێژدا بوو پێی ووت رووگەکەی نادروستە دەبێت لە ناو نوێژەکە یەکسەر رووی خۆ بگۆڕی بۆ رووە راستەکە. وە نوێژەکەی دروستەو تەواوە.

## دووەم: وەستان (القيام)

٥- وە پێویستە بە پێوە نوێژ بکات، وە ئەمەش روکنە ئیلا لەسەر:

- ئەوەی لە شەڕێکی قورسدایە و نوێژی ترس (صلاة الخوف) دەکات، بۆی هەیە لەسەر پشتی سوارە نوێژ بکات، وە بۆ ئەو نەخۆشەی کە ناتوانێ بوەستێت، ئەوا نوێژ دەکات بە دانیشتنەوە گەر توانی، ئەگەر نا بە پاڵکەوتنەو وە ئەوەی نوێژی سوونەت دەکات بۆی هەیە بە دانیشتنەوە نوێژ بکات یان بە سوارەو یان بە دانیشتنەوە گەر حەزی کرد، وە رکوع و کڕنوش دەبات بە ئیشارەت کردنی سەری، هەروەها نەخۆشیش، وە کڕنوشەکەی لە رکوعەکەی نزمتر دەکات.

٦- وە دروست نییە بۆ ئەو کەسەی بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات شتێکی بەرز لەسەر زەویدا دابنێت تا سوژدەی لەسەر بیات، بەڵکو سوژدەکەی نزمتر دەبێت لە رکوعەکەی ئەگەر نەیدەتوانی نێو چەوانی بگەیەنێتە زەوی.

## نوێژ کردن لە کەشتی یان فڕۆکە:

٧- وە کردنی نوێژی فەرز لە ناو کەشتیدا دروستە، هەروەها لە ناو فڕۆکەش.

٨- وە بۆی هەیە بە دانیشتنەوە نوێژ بکات گەر ترسی کەوتنی هەبوو.

٩- بۆی دروستە خۆی بگرێت لە وەستانەکەی بە کۆڵگەیەك یان دارێك لەبەر گەورەیی تەمەنی یان بێ هێزی لاشەی.

## ئەنجامدانی وەستان و دانیشتن لەیەك نوێژدا:

١٠- وە بۆی هەیە شەو نوێژ بکات بە پێوە یان بە دانیشتنەوە بە بێ عوزر یان هەر دووکیان بکات، نوێژ بکات و قورئانەکە بە دانیشتنەوە بخوێنێ، وە پێش رکوع بردنەکە، هەڵسێتەوە ئەوەی مارد لە قورئانەکە تەواوی بکات پاشان بچێتە رکوع و سوژدە پاشان ئەمە دووبارە بکاتەوە لە رکاتی دووەم (گەر حەزی کرد).

١١- وە ئەگەر بە دانیشتنەوە نوێژی کرد با دانیشێت یان هەر دانیشتنێکی تر کە بۆی دەگونجا.

## نوێژ کردن بە نەعلەوە:

١٢- وە بۆی هەیە بە پێی پەتی بوەستێت، بە هەمان شێوە بۆی هەیە بە نەعلەوە نوێژ بکات.

١٣- وە چاکتر وایە جارێك ئاوا و جارێك ئاوا، چۆنی بۆ گونجا خۆی ماندوو ناکات بۆ لەبەر کردنی یان داکەندنی، بەڵکو گەر بە پێی پەتی بوو، بە پێی پەتی نوێژ دەکات وە گەر نەعلی لە پێ بوو بە نەعلەوە نوێژ دەکات مەگەر بۆ شتێکی لە ناکاو[٢].

١٤- وە ئەگەر دایکەند نابێ لە لای راستی دابنێت. بەڵکو لە لای چەپی ئەگەر کەس لەلای چەپی نوێژی نەدەکرد، ئەگەر هەبوو ئەوا لە نێوان هەردوو پێی دایدەنێت، بەم شێوە بە (صحیح)ی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە[٣].

---

(٢) وەك ئەوەی نەعلەکە یان پێڵاوەکە پیسیەکی پێوە بێت دایکەنێت یان زەویەکە زۆر گەرم یان زۆر سارد بێت و لەبەری بکات (وەرگێڕ).

(٣) ووتم: ئەمەش ئاماژەیەکی ووردی تیایە کە لە پێش خۆی دا نەنێت. ئەم ئەدەبەش زۆربەی نوێژ خوێنان پشتگوێیان خستووە دەیان بینی رووە نەعلەکانیان نوێژ دەکەن.

## نوێژ کردن لەسەر مینبەر:

١٥- وە دروستە بۆ ئیمام نوێژ بکات لەسەر شوێنێکی بەرز بۆ فێر کردنی خەڵکەکە، لەسەرەوە بە پێوە دەوەستێت و (الله اکبر) دەکات و قورئان دەخوێنێت و رکوع دەبات هەر لەسەری پاشان دێتە خوارێ هەتا دەتوانێ سوژدە بەرێت لەسەر زەویەکە، پاشان بگەڕێتەوە سەری، وە لەرکاتی دووەمیش هەمان شت بکات.

## واجبی نوێژ کردن رووەو بەربەستێك (سترة) وە نزیکەوتنەوەی لێی:

١٦- وە واجبە نوێژ بکات رووە و بەربەستێك (سترة) یەك، لەمەش جیاوازی نییە لە مزگەوت بێت یان لە شوێنێکی تر یان لە نێوان گەورە و بچووکیی لەبەر گشتییەتی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): (لاتصل الا الی سترة، ولا تدع احدا يمر بين يديك، فان ابى فلتقاتله فان معه قرين)[٤].

---

(٤) ووتم: لێرەدا دەزانین ئەوەی خەڵکی ئەنجامی دەدەن لە هەموو مزگەوتەکان ئەوانەی لە سوریادا بینیومە وە مزگەوتەکانی تریش لە نوێژ کردن لە ناوەڕاستی مزگەوت دوور لە دیوار یان کۆڵەکە. ئیلا بێ ئاگاداری لە فەرمانی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

واتە: نوێژ مەکە ئیلا بەرامبەر بەربەستێك وە نەهێڵی کەس بەبەردەمتدا تێپەرێ، ئەگەر لا نەچو ئەرا شەڕی لەگەڵ بکە، چونکە ئەوە شەیتانی لەگەڵدایە.

١٧- وە پێویستە لێی نزیك بکەوێتەوە لەبەر فەرمانی پێکردنی پێغەمبەر (ﷺ) بەمە.

١٨- وە لە نێوان شوێنی سوژدە بردنی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو دیوارەی نوێژی بەرامبەر دەکرد وەك ڕێرەوی بەرانێك بوو[٥] هەر کەسێك ئەمە بکات ئەوە نزیکەوەتنەوە واجبەکەی بەجێ گەیاندووە.

## بڕی بەرزی سترەکە:

وە پێویستە سترەکە بەرز بێت لەسەر زەوی بستێك یان دوو بست لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): (اذ وضع احدكم بين يديه مثل مؤخرة الرحل فليصل ولا يبالي من وراء ذلك).

---

(٥) ووتم: لێرەدا دەزانین، ئەوەی خەڵکی ئەنجامی دەدەن لە هەموو مزگەوتەکان ئەوانەی لە سوریادا بینیومە وە مزگەوتەکانی تریش لە نوێژ کردن لە ناوەڕاستی مزگەوت دوور لە دیوار یان کۆڵەکە، ئیلا بێ ئاگایانە لە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ).

واتــە: گــەر یــەكێك لــە ئێـوە بەربەسـتێكی وەك دواوەی زیــن[٦] بێـت، بـا نوێـژ بكـات و گـوێ نـەدات بـەوەی لـەدوای بەربەستەكەیە.

١٩- وە راستەوخۆ رووی دەكاتـە سـترەكە، چونكـە روالـەتی فـەرمان كـردن بـە نوێـژ كـردن رووە و سـترە، ئـەوە دروپـات دەكاتـەوە وە هـەرچی بچێتـە لای چـەپی یـان راسـتی، بـە شێوەیەك رێك بەرامبەری نەبێت، ئەمە جێگیر نەبووە.

٢٠- وە دروسـتـە نوێـژ كـردن رووە و چیلكـە دارێكـی لـە زەویـدا چـەقیوو یـان هـاو شێوەی ئەمـە وە رووە و دارێـك یـان پایـەێك رە رووە و خێزانـە پالْكەوتووەكـەی لەسـەر جێگـە، كـە ئـەو لـە ژێـر پێخەفەكـەیدا بێـت، وە رووە و وولاخێك.

## حەرامی نوێژ كردن رووە و قەبر:

٢١- وە دروسـت نییـە نوێـژ كـردن رووە گـۆڕ بەشـێوەیەكی رەهـا جـا گۆڕەكـە گـۆڕی پێغەمبـەران بـوو یـان هـی كەسانێكی تر.

---

(٦) كە ئەو بەشەیە لە كۆتایی زینەكە بەرز بۆتەوە وە (رحل) بۆ ووشترە و (سرج)ە (زین) بۆ ئەسپە. وە لەم فەرموودەیەدا نیشانەی ئەوەی تیایە كە خەت كێشان لەسەر زەوی، جێگەی سترە ناگرێتەوە. وە ئەو فەرموودەی لەم بارەیەوە گێڕاوەتەوە لاوازە (ضعیف).

## حەرامی بەبەردەم دا چوونی نوێژ خوێن هەتا لە ناو مەککەش ( مسجد الحرام ):

٢٢- وە دروست نییە بە بەردەم نوێژ خوێندا تێپەڕ ببێت، ئەگەر سترەیەکی لە پێش خۆی دانابوو، وە لەمەدا هیچ جیاوازییەك لە (مسجد الحرام) بوو یان لە مزگەوتەکانی تر، هەموویان یەکسانن لە نادروستی‌یەکەی لەبەر گشتییەتی فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ): (لو یعلم المار بین یدي المصلي ماذا علیه لکان ان یقف اربعین، خیرا له من ان یمر بین یدیه).

واتە: گەر تێپەڕ بوو بە بەردەم نوێژ خوێن چی تاوانێکی ئەنجام داوە، ئەوا (چل)[7] دەوەستا چاکتر بوو لەوەی بەبەردەمی‌دا تێپەڕ ببایە. مەبەستی تێپەڕ بوونە لە نێوان سترەکەی و شوێنی سوژدەکەی.

## واجبیّ ڕێگە نەدان بە تێپەڕ بوو بە بەردەم نوێژ خوێن تێپەڕ بێت ئەگەر لە ناو مەککەشدا بێت:

٢٣- وە دروست نییە بۆ یەکێك ڕووەو بەربەستێك نوێژ بکات ڕێگە بدە بە یەکێك بە بەردەمی دا تێپەڕ بێت، لەبەر فەرموودەکەی ڕابردوو (ولا تدع احدا یمر بین

---

(٧) ڕاوی ئەم فەرموودەیە دڵنیا نییە لەوەی ئەم (چل)ە. چل ساڵە چل مانگە چل ڕۆژە یان چی مارەیەکە. (وەرگێڕ)

يديك...) وە لەبەر فەرموودەکەی تری (ﷺ) (اذا صلى احدكم الى شئ يستره من الناس فاراد احد ان يجتاز بين يديه فليدفعه في نحره، وليدرا ما استطاع (و في رواية: فليمنعه مرتين فان ابى فليقاتله فانما هو شيطان)).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی رووە و بەربەستێك کرد کە لە خەڵکەکەی دا دەبڕی. یەکێکیش ویستی بەبەردەمیدا بڕوات، با پاڵی پێوە بنێت. وە هەتا لە توانای دا هەیە رێگەی پێ نەدات (وە لە ریوایەتێکی تر: با دوو جار رێگەی لێ بگرێت) ئەگەر هەر تێپەڕی، ئەوا شەڕی لەگەڵدا بکە، چونکە ئەوە شەیتانە.

## رۆیشتن بۆ پێشەوە بۆ رێگری کردن لە بەبەردەم دا رۆیشتن:

٢٤- وە بۆی هەیە هەنگاوێك یان چەندهەنگاوێك بچێتە پێش بۆ ئەوەی رێگە بگرێ لە کەسێکی غەیرە (مكلف) لە منداڵ و ئاژەڵ بۆ ئەوەی بە پشتیدا بڕۆن.

## ئەوەی نوێژ دەبڕێت:

٢٥- وە لە گرنگی سترە لە نوێژدا، دەبێتە بەربەستێك لە نێوان ئەوەی بەرامبەری نوێژ ددکات و ئەوەی نوێژدکەی دەبڕێت بەبەردەم دا چوونی، بە پێچەوانەی ئەوەی

ستره‌ی دانه‌ناوه ئه‌وا نوێژه‌که‌ی ده‌بڕێت ئه‌گه‌ر ئافره‌تێکی پێگه‌یشتوو (بالغة)ی به‌به‌رده‌میدا ڕۆیشت، هه‌روه‌ها گوێ درێژ و سه‌گی ڕه‌ش.

## سێیه‌م: نیه‌ت (النية)

٢٦- وه پێویسته له‌سه‌ر نوێژ خوێن نیه‌تی ئه‌و نوێژه‌ی بهێنێ و به دڵی دیاری بکات که بۆی هه‌ڵساوه، وه‌ك فه‌رزی نیوه‌ڕۆ و عه‌سر یان سوونه‌ته‌کانیان بۆ نموونه، وه ئه‌مه‌ش مه‌رجه (شرط) یان ڕوکنه، به‌ڵام هه‌رچی ده‌ربڕینیه‌تی به زمان ئه‌وه بیدعه‌یه‌کی پێچه‌وانه‌ی سوونه‌ته، وه که‌س له ئیمامه‌کان فه‌رمانی به‌سه‌ردا نه‌کردووه.

## چواره‌م: (الله اكبر) ووتن (التكبير)

٢٧- پاشان نوێژه‌که‌ی ده‌ست پێ ده‌کات به (الله اكبر) ئه‌مه‌ش ڕوکنه له‌به‌ر فه‌رمووده‌که‌ی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ): ((مفتاح الصلاة الطهور و تحريمها التكبير، و تحليلها التسليم)) واته: کلیلی نوێژ ده‌ست نوێژه وه

حەرام کردنی بە (الله اکبر) ووتنە وە حەڵاڵ کردنی بە سەلام دانەوەیە[8].

٢٨- وە دەنگی بەرز ناکاتەوە لە هەموو نوێژەکان مەگەر ئیمام بێت.

٢٩- وە دروستە بانگبێژ (الله اکبر)ەکەی ئیمام دووبارە بکاتەوە بۆ خەڵکەکە ئەگەر پێویست دەکرا، وەك نەخۆش کەوتنی ئیمام، یان لاوازی دەنگی یان زۆری ئەوانەی نوێژ دەکەن بەدوایەوە.

٣٠- وە نابێ ئەوەی بە دوای ئیمامەوە نوێژ دەکات (مأموم) (الله اکبر) بکات هەتا ئیمامە نەیکات.

## بەرز کردنەوەی دەست و چۆنیەتییەکەی:

٣١- وە دەستی بەرز دەکاتەوە لەگەڵ (الله اکبر) کردن، یان لە پێشی یان لە پاشی هەموو و جێگیر بووە لە سووننەت.

٣٢- وە بەرزیان دەکاتەوە و پەنجەکانی لێك جیا دەکاتەوە.

٣٣- وە ناو لەپی بەرز دەکاتەوە تا ئاستی شانی وە هەندێ جار زیاتر بەرزی دەکاتەوە هەتا دەیگەیەنێتە ئاستی گوێیەکانی[9].

---

(٨) حەرام کردن، واتە قەدەغەکردنی ئەو شتانەی لە نوێژدا ناکرێت. وە حەڵاڵ کردنیشی واتە: رێ پێدانی ئەو شتانەی لە دەرەوەی نوێژ دەکرێن.

## دەست دانان و چۆنیەتییەکەی:

٣٤- پاشان دەستی راستی لەسەر دەستی چەپی دادەنێت لە پاش (الله اکبر) ووتنەکە، ئەمەش سوونەتی پێغەمبەرەکانە وە پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمانی داوە بە هاوەڵانی کە ئەنجامی بدەن، بۆیە دروست نییە بەریاندەیت.

٣٥- وە دەستی راستەی لەسەر پشتی ناو لەپی دەستی چەپ دادەنیٚ وە لەسەر مەچەك و بازوو.

٣٦- وە هەندیٚ جار بەراستەی دەستی چەپی دەگرێت[١٠].

## شوێنی دەست دانانەکە:

٣٧- وە تەنها لەسەر سنگی دایاندەنێت، پیاو و ئافرەت لەمەدا یەکسانن[١١].

٣٨- وە بۆی نییە دەستی راستی لەسەر کەمەرەی (خاصرة) ی دابنێت.

---

(٩) ووتم: وە گەیاندنی پەنجە گەورە بە نەرمایی گوێچکە، هیچ ئەصڵێکی نییە لە سوننەت. بەڵکو ئەمە لەلای من لە هۆیەکانی وەسوەسەیە.

(١٠) وە هەرچی ئەوەی (متاخرين) بە چاکیان زانیوە لە (جمع) کردن لە نێوان گرتن و لەسەر دانان لە هەمان کاتدا ئەوە ئەصڵی نییە.

(١١) ووتم: وە دانانیان لەسەر غەیری سنگ یان لاوازە (ضعيف) (واتە بەڵگەکەی) یان هەر ئەصڵی نییە.

## خشوع و ملکەچی نواندن و سەیر کردنی شوێنی سوژدە بردنەکە:

٣٩- وە پێویستە لەسەری ملکەچی بنوێنێت لە نوێژەکەیدا وە خۆی بە دوور بگرێت لە هەموو شتێك کە بێ ئاگایی دەکات لە نوێژەکە لە نەخش و نیگار و شتی رازاوە، وە نوێژ نەکات بە ئامادە بوونی خواردنێکی خۆش و بەتام هەروەها گەر گوشاری میز کردن و پیسایی کردنی لەسەر بوو.

٤٠- وە لە کاتی هەڵسانەوەی سەیری شوێنی کڕنووش بردنەکەی دەکات.

٤١- وە ئاوڕ نەداتەوە لە لای راستی و لە لای چەپی چونکە ئاوڕ دانەوە لە دزینی شەیتانە کە لە نوێژی مرۆڤ دەیدزێت.

٤٢- وە بۆی نییە سەیری ئاسمان بکات.

## دوعای کردنەوەی نوێژ (دعاء الاستفتاح):

٤٣- پاشان سەرەتا دەست دەکات بە خوێندنەوەی هەندێ لەو دوعایانەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتوون، کە ئەوانیش زۆرن، لەوانە: ((سبحانك اللهم بحمدك، وتبارك اسمك، تعالى جدك، ولا اله غيرك)).

وه فەرمان پێ کردنی پێغەمبەر (ﷺ) بەمە جێگیر بووە بۆیە پێویستە پارێزگاری لێ بکرێت[12].

## پێنجەم: خوێندنەوە (القراءة)

٤٤- پاشان پەنا دەگرێت بە خوا (واتە دەڵێت اعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ئەمەش واجبە، بە نەوتنی تاوانبار دەبێت.

٤٥- وە سوننەت وایە هەندێ جار بڵێت: (اعوذ بالله من الشیطان الرجیم من همزه و نفخه و نفثه).

٤٦- وە هەندێ جار بڵێت (اعوذ بالله السمیع العلیم من الشیطان الرجیم).

٤٧- وە پاشان بە نهێنی لە نوێژی نهێنی و ئاشکرا (السریة و الجهریة) (بسم الله الرحمن الرحیم ) بڵێت.

## خوێندنەوەی سوورەتی ( الفاتحة ) :

٤٨- پاشان سورەتی فاتحە دەخوێنێت بە تەواوەتی وە (بسم الله) کە ، ئەمەش روکنێکە بە بێ ئەو نوێژ

(١٢) هەر کەسێك حەز دەكات دووعایەكانی تریش بزانێت، با بگەڕێتەوە بۆ (صفة صلاة النبي) درێژەكە لاپەڕە (٨٣-٨٩) لە چاپی (١٥ یان ١٦) یان(٧)تەم.

دروست نیە و بەتاڵە، بۆیە پێویستە لەسەر غەیرە عەرەبەکان، لەبەری بکەن.

٤٩- ئەگەر هەر کەسێ نەیتوانی لەبەری بکات، ئەوە لەبری ئەو دەتوانێ بڵێت: (سبحان الله، و الحمد لله، ولااله الا الله، ولاحول ولا قوة الا بالله).

٥٠- وە سوننەت وایە لە خوێندنەوەی فاتیحە. ئایەت ئایەت بیخوێنێت لەسەر هەموو سەرە ئایەتێك تۆزێ بوەستێت. بڵێت: (بسم الله الرحمن الرحیم) پاشان بوەستێ، پاشان بڵێت (الحمد لله رب العالمین) پاشان بوەستێت، پاشان بڵێت (الرحمن الرحیم) پاشان بوەستێت، پاشان بڵێت (مالك یوم الدین) پاشان بوەستێت بەم شێوە تا کۆتایی.

بەم شێوە بوو هەموو خوێندنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر هەموو سەرە ئایەتەکانی دەوەستا وە ئایەتەکانی بە یەکەوە نەدەگەیاند ئەگەر چی ماناکانیشیان بەیەکەوە بەسترابێتەوە.

٥١- وە دروستە (مالك) بە ملك بخوێنرێتەوە.

## خوێندنەوەی ئەوەی لە پشت ئیمامەوە نوێژ دەکات:

٥٢- وە پێویستە ئەوەی لە پشت ئیمامەوە نوێژ دەکات فاتیحە بخوێنێت لە نوێژی نهێنی (السریة) (نیوەڕۆ و عەسر) هەروەها لە ئاشکراش (بەیانی و مەغریب و

عیشا) گەر گوێی لە ئیمام نەبوو، یان گەر ئیمام تۆزێك بێ دەنگ بوو، بۆ ئەوەی نوێژ خوێنەكان بتوانن بیخوێنن، هەر چەندە، ئەم بێ دەنگ بوونە پێمان وایە كە لە سوننەت جێگیر نەبووە[١٣].

## قورئان خوێندن لە دوای خوێندنی فاتیحە:

٥٣- وە سوننەتە لە دوای فاتحە چەند سورەتێكی تر بخوێندرێت هەتا لە نوێژی مردوو (صلاة الجنازة) یان چەند ئایەتێك لە دوو ركاتی یەكەم.

٥٤- وە قورئان خوێندنەكە درێژ دەكاتەوە هەندێ جار وە كورتی دەكاتەوە هەندێ جار لەبەر هاتنە پێشی رێگرێك، وەك سەفەر كردن یان كۆكین (سعال) یان نەخۆشی یان گریانی منالْ.

٥٥- وە خوێندنەوەكان جیاوازن بە گوێرەی نوێژەكان خوێندن لە نوێژی بە یانی لە هەموو نوێژەكانی تر درێژ ترە، پاشان نیوەڕۆ پاشان عەسر و عیشا پاشان مەغریب زۆربەی جار.

٥٦- وە خوێندن لە نوێژی شەو نوێژ لە هەموویان درێژ ترە.

---

(١٣) ووتم: لە سلسلة (الاحادیث الضعیفة) رقم (٥٤٦، ٥٤٧) باسی، بەڵگەی ئەوانەی بەڕاستی دەزانن كردوومە لەگەڵ چۆنیەتی وەڵامدانەوەیان.

٥٧- وه سوننەتە خوێندنەوەی ركاتی یەكەم له خوێندنەوەی ركاتی دووەم درێژ تر بێت.

٥٨- وه خوێندنی دوو ركاتی كۆتایی كورت بێت له دووركاتی یەكەم بە ئەندازەی نیوەی[١٤].

## خوێندنی سورەتی فاتیحە لە هەموو ركاتێك:

٥٩- وه واجبە خوێندنەوەی فاتیحە لە هەموو ركاتێكدا.

٦٠- و سوننەتە سورەتی تریش بخوێندرێت هەتا لە دوو ركاتەكەی كۆتایش هەندێ جار.

٦١- وه دروست نییە بۆ ئیمام قورئان زیاتر بخوێنێت لەوەی لە سوننەتدا هاتووە چونكە بەمە قورسی دەكاتە لەسەر ئەوانەی لە پشتیەوە نوێژ دەكەن لە پیاوانی پیر یان نەخۆش، یان ئافرەتی خاوەن منالی شیرەخۆر یان پێویستی دارێك (ذي الحاجة).

## بە نهێنی و بە ئاشكرا خوێندنی قورئان لە نوێژدا:

٦٢- وه بە دەنگی بەرز و ئاشكرا قورئانەكە دەخوێنێ لە نوێژی بەیانی، وه لە جومعە دوو چەژنەكە، وه نوێژی داوا كردنی باران (الاستسقاء) وه نوێژی خۆرگیران و

---

(١٤) درێژی ئەم باسە بۆی بگەڕێوە گەر حەزت كرد لە (صفة الصلاة) لاپەڕە (١٠٦-١٣٥) چاپی هەشتەم.

مانگ گیران (کسوف) وە دوو رکاتی یەکەمی نوێژی مەغریب وعیشا.

٦٣- وە دروستە بۆ ئیمام هەندێ جار ئایەتێك بە دەنگی بەرز بخوێنێت لە نوێژەکانی قورئان تیایدا بە نهێنی دەخوێندرێت.

٦٤- وە هەرچی دەیشارێتەوە، وە لەبەرز کردنەوەی دەنگیشی مام ناوەندی دەبێت.

## بە تەرتیل خوێندنی قورئان:

٦٥- وە سوننەت وایە بە تەرتیل قورئان بخوێندرێت نە زۆر بە خاوی و نە بە پەلەش، بەڵکو خوێندنەوەیەکی شیکارانە پیت بە پیت، وە قورئانەکە بڕازێنێتەوە بە دەنگی وە بە ئاواز بیخوێنێتەوە، بە گوێرەی ئەو سنور و ئەحکامە ناسراوانەی لای شارەزایانی زانستی (تجوید)ەوە نابێ بیخوێنێ لەسەر ئاوازی بیدعەچی یەکان و لەسەر قانونەکانی مۆسیقی.

## راست کردنەوە و بیر خستنەوەی ئیمام لە قورئان خوێندنەکەی:

٦٦- وە دروستە بۆ ئەوەی بە دوای ئیمامەوە نوێژ دەکات، گەر ئیمام لە خوێندنەوەی قورئانەکە لێی تێکچوو، بۆی راست بکاتەوە.

## شەشەم: چوونە رکوع

٦٧- گەر لە قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، ماوەیەکی کەم بێ دەنگ دەبێت بەقەدەر ماوەی هەناسەدانێك.

٦٨- وە دەڵێت (الله اكبر) وە ئەمەش واجبە.

٦٩- پاشان بچێتە رکوع و بچەمێتەوە بە قەد ماوەی تەواو جێگیر بوونی جومگەکانی وە هەموو ئەندامێك شوێنی خۆی دەگرێ ئەمەش روکنە.

## چۆنیەتی چوونە رکوع:

٧٠- هەردوو دەستی لەسەر هەردوو ئەژنۆی دادەنێت. وە بە تەواوەتی دوو ئەژنۆکەی دەگرێت، وە پەنجەکانی وەك ئەوەی ئەژنۆی گرتبێت، ئەمانەش هەموو واجبە.

٧١- وە پشتی درێژ دەکاتەو رێکی دەخات، هەتا گەر ئاوی لەسەر رژێندرا لەسەری بوەستێت، ئەمەش واجبە.

٧٢- وە سەری نزم ناکاتەوە و بەرزیشی ناکاتەو، بەڵکو رێکی پیشتی دەکات.

٧٣- وە هەردوو ئانیشکەکانی لە تەنیشتەکانی دوور دەخاتەوە.

٧٤- وە لە رکوع بردنەکەی دەڵێت: (سبحان ربي العظيم) سێ جار.

## وەك یەك لێ كردنی روكنەكان:

٧٥- وە سوننەتە، روكنەكان وەك یەكی لێ بكات، لە ماوەكانیان كە ركوعی و هەڵسانەوەی لە دوای ركوع و كڕنوش بردنەكەی و دانیشتنەكەی لە نێوان دوو كرنووشەكەیدا نزیك بن لە یەكسانی ئەو ماوەی كە بۆ ئەنجام دانیان دەخایەنێت.

٧٦- وە دروست نییە قورئان بخوێنێت لە ركوع و كڕنوشدا.

## رێك بوونەوە لە ركوع دا:

٧٧- پاشان پشتی بەرز دەكاتەوە لە ركوع، ئەمەش روكنە.

٧٨- لە كاتی بەرز بوونەوەكەدا دەڵێت (سمع الله لمن حمده) ئەمەش واجبە.

٧٩- وە لە كاتی بەرز بوونەوەكەدا دەستی بەرز دەكاتەوە بە هەمان شێوەی پێشوو.

٨٠- پاشان بەرێكی دەوەستێت بە دڵنیایی[١٥] تا هەموو ئێسقانەكانی شوێنی خۆیان دەگرنەوە، ئەمەش روكنە.

٨١- وە لە كاتی وەستانەكەی دەڵێت (ربنا ولك الحمد)[١٦] ئەمەش واجبە لەسەر نوێژ خوێنێك ئەگەر چی لە پشت ئیمامەوە نوێژی دەكرد.

---

(١٥) واتە لەسەر خۆیی بە بێ پەلە كردن.

٨٢- وه ماوەكەی ئەم راست بوونەوه و ركوعەكە وەك يەك لێ دەكات وەك باسمان كرد.

## حەوتەم: كڕنوش (السجود)

٨٣- پاشان دەڵێت (الله اكبر) ئەمەش واجبە.

٨٤- وه دەستی بەرز دەكاتەوه هەندێ جار.

### چوونە سوژدە بە هەردوو دەستەكە :

٨٥- پاشان دەچێتە كرنوش دەستەكانی دادەنێت پێش ئەژنۆی بەمە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی داوه، هەر ئەمەش جێگیر بووه لە كرداری (ﷺ) وه نەهی كردووه لە دانیشتنی ووشتر كە ئەويش دوو ئەژنۆی پێشەوەی پێش دەخات.

٨٦- كاتێك كڕنووش دەبات ئيعتماد دەكاتە سەر هەردوو دەستی.

٨٧- وه پەنجەكانی پێكەوه دەنوسێنێت.

٨٨- وه ئاراستەی قيبلەيان دەكات.

٨٩- وه هەردوو دەستی لە ئاستی هەردوو شانی دادەنێت.

---

(١٦ ) لەم شوێنە كۆمەڵێ ئەزكاری تريش هەيە كە دەوروترێ بگەڕێوه (صفة صلاة/ ص١٥٣) چاپی حەوتەم.

٩٠- هەندێ جاریش لە ئاست گوێ دایان دەنێت.
٩١- وە هەردوو ئانیشکی بەرز دەکاتەو لەسەر زەوی.
٩٢- وە لوتی و تەوێلی لەسەر زەویەکە دەچەسپێنێت و ئەمەش روکنە.
٩٣- هەروەها هەردوو ئەژنۆی لەگەڵ زەویدا دەچەسپێنێ.
٩٤- هەروەها پەنجەکانی پێی.
٩٥- وە دەیانچەقێنێت، ئەمانەش هەمووی واجبن.
٩٦- وە پەنجەکانی پێی بە ئاراستەی قیبلە دادەنێت.

## ڕێك بوونەوە لە سوژدەدا :

٩٧- وە واجبە لەسەری راست ببێت لە سوژدەکەیدا ئەمەش بە پشت بەستنی بە هەموو ئەندامەکانی سوژدە بە یەکسانی، کە ئەوانەش: نێو چەوان و لووت پێکەوە. وە هەردوو دەست، وە دوو ئەژنۆکە، وە پەنجەکانی پێ.
٩٨- جا هەر کەسێ بەم شێوەیە کڕنوشی برد ئەوا دڵنیابووە لەوەی بە تەواوەتی کڕنووشی بردووە، وە دڵنیا بوون (اطمانان) لە سوژدەدا روکنە.
٩٩- وە تیایدا دەڵێت (سبحان ربی الاعلی) سێ جار یان زیاتر.
١٠٠- وە چاکە (مستحب)ە کە دوعای زۆر تیا بکرێت چونکە شوێنی گیرا بوونی دوعایە.

١٠١- وه سوژدەکەی بە قەد ركوعەكەی لىٚ دەكات وەك باسكرا.

١٠٢- وه دروسته کڕنووش بردن لەسەر زەوی وه لەسەر جیا کەرەوەیەك (حائل) له نێوان زەویەکه و نێو چەوانی له جل یان حەسیرێك یان هاوشێوەی ئەمانه.

١٠٣- وه دروست نییه قورئان بخوێنیٚ لەوکاتەی له سوژدەدایه.

## پێ راخستن و چەقاندن له نێوان دوو کرنووشەکه :

١٠٤- پاشان سەری بەرز دەکاتەو (الله اكبر) دەكات ئەمەش واجبه.

١٠٥- وه هەندیٚ جار دەستی بەرز دەکاتەوه.

١٠٦- پاشان دادەنیشێت بە دڵنیابوونەوه. هەتا هەموو ئەندامێك دەگەڕێتەوه شوێنی خۆی ئەمەش روکنه.

١٠٧- قاچی چەپی رادەخات و لەسەری دادەنیشێت، ئەمەش واجبه.

١٠٨- وه قاچی راستی دەچەقێنێت.

١٠٩- وه پەنجەکانی به ئاراستەی قیبله دادەنێت.

١١٠- وه دەتوانێت هەندیٚ جار لەسەر پاژنەی پێی و پێشەوەی پێی دانیشێت و بچەقێنێت.

١١١- لەم دانیشتنەشدا دەڵێت (اللهم اغفر لي وارحمني و اجبرني و ارفعني و عافني و ارزقني).

١١٢- وە ئەگەر حەزی کرد دەڵێت (رب اغفر لي ، رب اغفر لي).

١١٣- ئەم دانیشتنەش درێژ دەکاتەوە تا وەك كڕنووش بردنەکەی لێ دەکات.

## كڕنوشی دووەم:

١١٤- پاشان دەڵێت (الله اکبر) ئەمەش واجبە.

١١٥- دەستی بەرز دەکاتەو لەگەڵ ئەم (الله اکبر) ووتنە هەندێ جار.

١١٦- پاشان سوژدەی دووەم دەبات .

١١٧- ئەوەی لە یەکەم ئەنجامی دا تیایدا ئەنجامی دەدات.

## دانیشتنی پشوودان ( جلسة الاستراحة ):

١١٨- کاتێك سەری بەرز دەکاتەوە لە سوژدەی دووەم وە ویستی هەڵسێتەوە بۆ رکاتی دووەم دەڵێت (الله اکبر) ئەمەش واجبە.

١١٩- وە دەستی بەرز دەکاتەوە هەندێ جار.

١٢٠- وە بە رێکی دادەنیشێت پێش ئەوەی هەڵسێتەوە لەسەر پێی چەپی، هەتا هەموو ئەندامێك دەگەڕێتەو شوێنی خۆی.

## ركاتی دووەم:

١٢١- پاشان هەڵدەستێتەوە بۆ ركاتی دووەم بە هەردوو دەستی وە دەستی دەگرێت وەك چۆن هەویر شێلەر دەستی دەگرێت، ئەمەش روکنە.

١٢٢- پاشان ئەوەی لە كاتی یەكەم ئەنجامی دا لە ركاتی دووەم ئەنجامی دەداتەوە.

١٢٣- تەنها ئەوە نەبێ كە دوعای كردنەوەی نوێژ (دعا الاستفتاح) ناخوێنێتەوە.

١٢٤- لە ركاتی یەكەم كورتری دەكاتەوە.

## دانیشتن بۆ تەحیات:

١٢٥- كاتێك لە ركاتی دووەم تەواو دەبێت دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن.

١٢٦- وەك چۆن لە نێوان دوو كڕنووشدا دادەنیشت، ئاوا دادەنیشێتەوە.

١٢٧- بەڵام نابێ پیی بچەقێنێ.

١٢٨- وە دەستی راستی لەسەر ران و ئەژنۆی راستی دادەنێت وە كۆتایی ئانیشكی لەسەر رانی چەپی دادەنێت لێی دوور ناخاتەوە.

١٢٩- وە دەستی چەپی لەسەر ران و ئەژنۆی چەپی دادەنێت.

## جولاَندنەوەی پە نجە و سەیر كردنی :

١٣٠- هەموو پەنجەكانی دەستی راستی كۆ دەكاتەوە، وە هەندیّ جار پەنجە گەورەی دەخاتە سەر پەنجەی ناوەڕاستی.

١٣١- وە هەندیّ جار بازنەیەكی پیّ دروست دەكات.

١٣٢- وە بە پەنجەی شایەتمان ئیشارەت دەكات رووە و قیبلە.

١٣٣- وە بە چاویشی سەیری دەكات.

١٣٤- وە دەیجوولێنێت و دووعای پیّ دەكات لەسەرەتای تەحیات هەتا كۆتاییەكەی.

١٣٥- بەلاَم بە پەنجەی دەستی چەپی ئیشارەت ناكات.

١٣٦- هەموو ئەمە لە تەحیاتدا دەیكات.

## چۆنیەتی تەحیات و دوعا كردن لە پاشی :

١٣٧- تەحیات وتن واجبە، گەر بیری چوو دووجار سوژدەی سەهو دەبات.

١٣٨- وە بە نهێنی (تەحیاتەكە) دەخوێنێت.

١٣٩- چۆنیەتیەكەی (التحیات لله و الصلوات و الطیبات السلام علی النبي ورحمة الله وبركاته السلام علینا و علی عباد الله الصالحین و اشهد ان لااله الا الله و اشهد ان محمد عبده و رسوله). پاشان

١٤٠- پاشان سلاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) وە دەڵێت (اللهم صلي على محمد و على ال محمد كما صليت على ابراهيم و على ال ابراهيم، انك حميد مجيد اللهم بارك على محمد و على ال محمد كما باركت على ابراهيم و على ال ابراهيم انك حميد مجيد).

١٤١- وە ئەگەر حەزی کرد کورتی بکەیتەوە دەڵێی (اللهم صلي على محمد و على ال محمد و بارك على محمد و على ال محمد كما صليت و باركت على ابراهيم و على ال ابراهيم انك حميد مجيد).

١٤٢- پاشان کام دوعای پێ باش بوو لەو دوعایانە لە سوننەتدا هاتوون ئەوا پێی لە خودا دەپاڕێتەوە.

## سێیەم و چوارەم:

١٤٣- پاشان (الله اكبر) دەکات، وە سوننەت وایە، لە کاتی دانیشتنەکە (الله اكبر)ەکە بکرێت.

١٤٤- وە هەندێ جار دەستی بەرز دەکاتەوە.

١٤٥- پاشان هەڵدەستێتەوە بۆ رکاتی سێیەم ئەمەش روکنە وەك ئەوەی لە پاش ئەو دێت.

١٤٦- هەمان شت دەکات گەر ویستی هەڵسێتەوە بۆ رکاتی چوارەم.

١٤٧- بەلام پێش ئەوەی هەڵسێتەوە، لەسەر قاچی چەپی دادەنیشێت، تا هەموو ئێسقانەکانی دەگەرێنەوە شوێنی خۆیان.

١٤٨- پاشان بە یارمەتی دەستەکانی هەڵدەستێتەوە، وەك هەڵسانەوەی بۆ رکاتی دووەم.

١٤٩- پاشان لە هەر یەك لە رکاتی سێیەم و چوارەم سورەتی فاتیحە دەخوێنێت. ئەمەش واجبە.

١٥٠- وە ئایەتێك یان هەندێ ئایەتی لەگەڵدا دەخوێنێت هەندێ جار.

## قنووت خوێندن لەبەر ناخۆشیەك وە شوێنەکەی:

١٥١- وە سوننەتە قنوت بکات و دوعا بۆ موسلمانان بکات لەو کاتەی ناخۆشی روویان تێدەکات.

١٥٢- وە شوێنەکەی کاتێك دەڵێت (ربنا لك الحمد) لە دوای ئەو.

١٥٣- وە دوعایەکی تایبەتکراوی نییە، بەڵکو بە گوێرەی کێشە دوعا دەکات.

١٥٤- وە دەستی بەرز دەکاتەو لەم دوعایە.

١٥٥- وە بەدەنگی بەرز دەیخوێننێت گەر ئیمام بوو.

١٥٦- وەئەوەی لەپشت ئەو نوێژ دەکەن (امین)ی بۆ دەکەن.

١٥٧-کاتێك تەوادەبی (الله اکبر)دەکات و دەچێتە سوژدە.

## قنووتی سوننەت و چۆنیەتیەکەی:

١٥٨- وە هەرچی قنوت کردنە لە نوێژی ویتر هەندێ جار دروستە.

١٥٩- شوێنەکەیشی پێش چوونە رکوعە، بە پێچەوانەی قنووتی ناخۆشی و گیر و گرفت.

١٦٠- وە ئەم دوعایەی تیا دەخوێنێت:(اللهم اهدني فيمن هديت و عافني فيمن عافيت و تولني فيمن توليت و بارك لي فيما اعطيت و قني شر ما قضيت فانك تقضي ولايقضى عليك و انه لا يذل من واليت ولايعز من عاديت تباركت ربنا وتعاليت لامنجا منك الا اليك).

١٦١- وە ئەم دوعایە لە فێر کردنی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لەمەی زیاتر ناکات ئیلا سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دروستە چونکە لە صەحابیەکان هاتووە.

١٦٢-پاشان رکوع دەبات و دووسوژدە دەبات وەك باسکرا.

## تەحیاتی کۆتایی و دانیشتن (تورك):

١٦٣- پاشان دادەنیشێت بۆ تەحیاتی کۆتایی، وە هەردووکیان واجبن.

١٦٤- ئەوەی لەتەحیاتی یەکەم ئەنجامی دا لە دووەمیش ئەنجامی دەدات.

١٦٥- تەنها ئەوە نەبێ کە تیایدا بە (تورك) دادەنیشێت ئەویش لەسەر سمتی چەپی دادەنیشێت، قاچی چەپی لە ژێر قاچی راست دەباتە دەرەوە.

١٦٦- وە قاچی راستی دەچەقێنێت.

١٦٧- وە دروستە هەندێ جار رایبخات.

١٦٨- وە بە لەپی دەستی راستی ئەژنۆی توند دەگرێت و خۆی بەو راگیر دەکات.

## واجبی سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) وە چوار خۆ پاراستنەکە :

١٦٩- وە پێویستە لەو تەحیاتە سەلاوات بدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لە تەحیاتی یەکەم باسی هەندێ جۆری سەلاواتدان کرا.

١٧٠- وە خۆی بپارێزی و پەنابگرێ بە خوا لەم چوارە: بلێت: (اللهم اني اعوذ بك من عذاب جهنم، و اعو ذ بك من عذاب القبر و من فتنة المحيا و الممات، و من شر فتنة المسيح الدجال).

واتە : خوایە خۆم دەپارێزم و پەنا دەدەم، لە سزای دۆزەخ و سزای گۆڕ وە لە فیتنەی ژیانی دنیا وە لە فتنەی ناو گۆڕ وە فتنەی دەجال.

## دوعا كردن پێش سەلام دانەوە:

١٧١- پاشان دوعا دەكات بۆ خۆی ئەوەی پێی چاك بێت كە هاتبێت لە قورئان و سوننە كە زۆرە بەڵام گەر هیچی نەدەزانی ئەوەبۆی هەیە چی لەلا خۆش و ئاسان بوو لە دوعا ئەوەبڵێت بۆ سوودی دینی و دنیای.

## سەلام دانەوە و جۆرەكانی:

١٧٢- پاشان سەلام لە لای راستی دەكات ئەمەش روكنە تا سپیایی روومەتی لای راستی دەبینرێت.

١٧٣- وە لەلای چەپی هەتا سپیایی ،روومەتی چەپی دەبینرێت ئەگەر چی لە نوێژی مردووشدا بوو (صلاة الجنازة).

١٧٤- وە ئیمام لە سلام دانەوە كە دەنگی بەرز دەكاتەوە ئیلا لە نوێژی مردوو نەبێ.

١٧٥- ئەمەش بە چەند شێوەیەكە:

یەكەم: (السلام علیكم و رحمە الله و بركاتە) لە لای راستی وە (السلام علكم ورحمە الله) لە لای چەپی.

دووەم: وەك ئەوەی یەكەم بە بێ ووتنی (وبركاتە).

سێیەم: (السلام علیكم و رحمە الله) لە لای راستی (السلام علیكم) لە لای چەپی.

چـوارەم: یـەك سـەلام دەكـات بەرامبـەر خـۆی تـۆزی سەری بۆ لای راستی خوار دەكاتەوە.

## برای موسلمانم :

ئەمەم بۆ كرا لـە كورت كردنـەوەی (صفة صلاة النبي (ﷺ)) بەمەش هەوڵمدا لێت نزیـك بكـەوێت تـا لـە لات روون بێت وەك ئەوەی بە چاوی خـۆت ببیبینیـت، ئەگـەر تـۆ ئـاوا نوێژ بكـەیت وەك چۆن بـۆم وەسـف كـردی هیـوادارم خـوای گـەورە لێتـی وەرگرتبێـت، چونكـە تـۆ بەمـە فەرمایشـتەكەی پێغەمبەر (ﷺ) بەجیٚ گەیاندووە كە دەفەرمووێت: (صلـــــوا كما رایتموني اصلي) واتە: نوێژ بكەن وەك چۆن من دەبینن نوێژ دەكەم.

پاشـان دەبیٚ لـەبیرت نـەچیٚ. كـە بـە دڵ و بەخشـوعی یـەوە ئـەنجامی بـدەی. چونكـە هـەر ئەمـە ئامـانجی هـەرە گەورەیە لە وەستان لەبەردەم خوای گەورە، جا بە گوێرەی جیٚ بە جیٚ كردنت ئەوەی بۆم باس كردی لە چۆنیەتیەكـەی و خشوع و ملكەچییەكەی.

ئەوا بەروبوومـە داوا كـراوە بە دەستی دەهێنیـت، كـە پـەروەردگارمان ئامـاژەی پـیٚ كـردووە كـە دەفـەرموێت: (ان الصلاة تنهى عن الفحشاء و المنكر).

## له کۆتایی دا

داوا کارم له خوای گەورە نوێژەکانمان قبولْ بکات وە سەرجەم کردارە چاکەکانی تر . وە پاداشتەکانیان بۆمان هەڵگرێ تا ئەو رۆژەی پێی دەگەین ئەو رۆژەی (یوم لا ینفع مال ولا بنون الا من اتى الله بقلب سليم).

# پـــیـــڕســـت










وضع خاطئ لرفع اليدين
ينبغي أن يرفع يديه في هذا
الموضع كما في صورة (١ أو ٢)







**تێبینی :**

**بـۆ زیـاتر کــەڵك وەرگرتــن لــەم نامیلکەیــە ئــەم وێنانەشمان بۆ زیاد کرد.** **( وەرگێڕ )**

# چۆنیەتی نوێژی نەخۆش و

# خـــۆ پاك كردنەوەی

**نوسینی :**

زانای پایەبەرزابن باز

**وەرگێرانی :**

إلیاس كوردی

## (( پێشەکی وەرگێر ))

إن الحمد لله نحمده،ونستعينه،نستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، ومن يضلل فلا هادي له ، أشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

﴿ يأيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون﴾
ال عمران(١٠٢)

﴿ يأيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة ، وخلق منها زوجها وبث منهما رجالا كثيرا ونساء واتقوا الله الذي تساءلون به والأرحام إن الله كان عليكم رقيبا ﴾

النساء : ١

﴿يأيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما ﴾ الأحزاب٧٠-٧١

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ) وشر الامور محدثاتها ، وكل محدثة بدعة، ، وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

سوننەتی خوا وایە لەسەر زەوی کە مرۆڤەکان تووشی بەڵاو تاقی کردنەوە و ناخۆشی ببن . بۆ ئەوەی جیا کرێتەوە سوپاس کارو ئارامگر لە بێ سەبرو نکۆڵی کەر جا یەکێك لەو تاقی کردنانەوە (نەخۆش کەوتن)ە جا لەبەر ئەوەی شەریعەتی پاکی ئیسلام لەسەر بنچینەی ئاسنکاری دامەزراوە . خوای گەورە عیبادەتەکانی لەسەر بەندە ناساغ ونا تەواوەکان سووك کردووە .
ئینجا چۆنەو چەند و کەی نەخۆشی و نا تەواویەکان کاردەکەن سەر عیبادەکان . وە لەو کاتانە عیبادەتەکان چۆن ئەجام دەدەرێن ئا نەمانە چەند پرسیارێکن . زۆڕ بەمان حەز بە زانینی وەڵاماکانیان دەکەین چونکە زۆر بەمان تووشی نەخۆشی و نا تەواوی دەبین . لەبەر ووردی باسەکان و کەمی باسکردنیان لە کتێبە فقهیەکان زۆر بەمان شارەزایان نین .
هەندێ حاریش پرسیار لە هەندێ کەس دەکەین کە لە وانەیە زۆر جار بەهەڵەو تێنەگیشتنەوە وەڵامان بدەنەوە ئینجا بۆ ئەوەی شارەزای ئەم مەسەلانە و ئەم ئەحکامانە بین بە چاکترین و ڕاسترین شێوە . با لە دەمی زانایەکی بەرزی وەك - شێخ عبدالله بن باز -

(ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) ئەم حوکمانە ببیستین کە لەم نووسراوەی بەر دەست دا باسی کردووە بە پاڵپشتی بەڵگەکانی قورئان و سوننە . بەشێوەیەکی پوخت و جوان یەکە یەکەی لایەن و حاڵەتەکانی روون کردۆ تەوە و دیاری کردووە .

کە بەڕاستی شایەنی ئەوەیە هەموو موسوڵمانیك بیخوێنێتەوە و سوودی لێ وەربگرێت - چونکە ئەم باسە قسەی زانایەکە وەك فتوا وایە . نەك قسەی هەموو کەسێ ، جگە لەمەش لە کۆتایی باسەکەیشدا ئامادەکارانی ئەم نووسراوە (دار الوطن) کۆمەڵێ لە فەرموودەکانی پێغەمبەری خوایان هێناوە(ﷺ)لەسەر فەزڵی تووش بوون بە نەخۆشی و بەلاو موسیبەت و سەبر گرتن لەسەری هەروەها لەگەڵ دیاری کردنی چارەسەر کردنی نەخۆشی بە دوعاو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز ، هیوادارم بە وەرگێرانی ئەم نووسراوە سوودم گەیاندبێت بە دینی خوا و موسوڵمانانی یەکخوا پەرست . خوای گەورە لە نەخۆشی و ناخۆشی بە دوورمان بگرێ امین

وصلى الله وسلم على محمد (ﷺ)واله وصحبه وسلم

الياس الكردي ١٠/محرم /١٤٢٢هجري سلێمانی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين . والصلاة والسلام على اشرف الأنبياء والمرسلين . نبينا محمد (ﷺ) . وعلى اله وصحبه اجمعين وبعد :

ئەمە نووسراوێکی کورتە . پەیوەندارە بە هەندێ لە ئەحکامی چۆنیەتی خۆ پاکرنەوەی نەخۆش و چۆنیەتی نوێژ کردنی کەسێکی نەخۆش خوای گەورە داینـاوە پاکیەتی بۆ هەموو نوێژێك . جا لادانی بێ دەست نوێژی و لەش گرانی وە لادانی پیسی لەسەر لەش یان جل وە شوێنی نوێژ تیاکردنەکە . دوو مەرجی لە مەرجەکانی دروستی نوێژ گەر موسوڵمان ویستی نوێژی بکات دەبێ دەست نوێژ بگرێت بۆ بێ نوێژی بچووك (الحدث الاصغر)لە لەشی دەربکات یان خۆی بشوات گەر . لەشی گران بوو (الحدث الاكبر) وە پێویست دەکات لەسەر ئەوکەسەی میزدەکات یان دەچێتە سەر ئاو خۆی پاك بکاتەوە . پێش ئەوەی دەست نوێژ بگرێ . بۆ ئەوەی پاکیە کەی تەواو تربێت . ئێستاش هەندێ لەو ئەحکامە پەیوەندارانە باس دەکەین . .

## ئەحکامەکانی خۆپاکردنەوەو نوێژ کردن

خۆپاکردنەوە بە ئاو (الاستنجاء)واجبە لەوەی لە پاش وپێش دەرچێت . وەك میز و پیسایی

وە لەسەر ئەو کەسەی نووستووە یان بایەکی لێ بەز بووە خۆ پاکردنەوە (تارەت) پێویست ناکات . بەڵکو دەست نوێژ گرتنەوەی پێویستە چونکە خۆ پاك کرنەوە داندراوە بۆ لادانی پیسی . لێرەیشدا هیچ پیسیەك بەدی ناکرێ .

وە خۆپاکرنەوە بە بەرد (الاستجمار) . جێگەی خۆ پاکردنەوە بە ئاو (الاستنجاء) دەگرێتەوە . جا بە بەرد دەبێت ، یان شتێ هاوشێوەی بەرد بێت .. وە پێویستە بۆی ، سێ بەردی پاك ، لەبەر ئەو فەرموودەی لە پێغەمبەر(ﷺ) هاتووە کە دەفەرمووێ : (من استجمر فليو تر)

واتە : هەرکەسێ بە بەرد خۆی پاك کردەوە با بەچەند جارێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە وە دەفەرمووێ ( اذا ذهب احدكم الى الغائط فليذهب ومعه بثلاثة احجار ، فأنهاتجزئ عنه )[1]

---

(١ ) رواه ابو داود

واتە ( هەرکەسێکتان چوو بۆ سەر ئاوکردن با سێ بەرد لەگەڵ خۆی ببات . چونکە ئەمانە جێگەی ئاوە کە دەگرنەوە ) هەروەها نەهی کردووە لە (الا ستجمار بأقل من ثلاثة احجار) [2]

واتە : نەهی کردووە لە خۆ پاکردنەوە بەکەمتر لەسێ بەرد . وە دەروست نی یە خۆ پاکردنەوە بە پاشەڕۆ (روث) یان ئێسقان (غظم) یان خواردن . وە هەموو شتێك کە حورمەتی هەبێت . وە چاکتر وایە مرۆڤ خۆی بە بەرد پاك بکاتەوە یان هاو شێوەی بەرد وەك دەسەسڕو ئەمانە . پاشان ئاوی بە دوادا بهێنێت ، چونکە بەردەکە خودی پیسیەکەی لادەدات ، وە ئاوەکەیش شێونەکە پاك دەکاتەوە ، ئەمەش چاکتر و تەواو ترە وە مرۆڤ سەرپشکە لە نێوان ئەوەی بە ئاو خۆی پاك بکاتەوە یان بە بەرد یان بە هەردووکیان ، لە انس —رض هاتووە کە فەرموویەتی ((کان النبي —= یدخل الخلاء فأحمل انا وغلام نحوي اداوة من ماء و عنزة فیستنجي بالماء )) [3]

---

(٢ ) رواه مسلم .

(٣ ) رواة متفق علیه .

واتە : من و منالێکی وەك خۆم کوونەیەك ئاو وچەڵە دارێکمان بۆی دەبرد . خۆی بە ئاوە کە پاك دەکردە) و .
لە عائیشە وە (رض الله عنها) کەوا بەهەندێ ئافرەتی ووت ((مرن ازواجکن ان یستطیبوا بالماء فأني استحییهم ، وان رسول الله کان یفعله ذلك)) [٤]

واتە : بەهاوسەر کانتان بڵێن خۆیان پاك بکەنەوە بە ئاو . چونکە خۆم شەرم دەکەم پێیان بڵێم زوپێغەمبەریش(ﷺ) ئەمەی ئەنجام دەدا .

* وە ئەگەر ویستی تەنها یەکێکیان ئەنجام بدات ، ئەوا ئاوەکە چاکترە ، چونکە ئاو شوێنی پیس بوونەکە پاك دەکاتەوە وە خودی پیسیەکەو شوێنەوارەکەیشی پاك دەکاتەوە . وە بۆ پاکردنەوەی تەواوەتی هەر ئەو چاکترە و وە ئەگەر تەنها بە بەرد پاکردنەوەکەی بەکار هێنا ئەوا دەبێ سێ بەرد بێت . ئەگەر پێی پاکرایەوە بەلآم ئەکەر تەواو پاکی نەکردوەوە . بەردی چوارەم وە وپێنجەمی بۆ زیاد دەکات . تا شوێنەکەی بە تەواوتی پاك دەکاتەوە .

(٤ )رواه البخاري (١٥٣)و مسلم (٣٧١) .

وە چاکتروایـە : ژمـارەی بـەردەکان تـاك بێـت . لەبـەر فـەرموودەی پێغەمبـەر(ﷺ) (مـن اسـتجمر فليوتـر) واتـە : هەرکەسێ بـە بـەرد خـۆی پـاك کـردەوە بـا ژمـارەی بـەردەکانی تـاك بـن ) وە دروسـت نىیـە بـە خـۆ پاکردنەوەکە بە ، بە دەستی ڕاست لەبەر فەرموودەکەی سلمان کە دەفەرمووێ (نهانا رسـول لله ان يسـتنجي احدنـا بيمينه)) [٥]

واتـە : پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)لێ ی قەدەغـە کردوویـن دەستی ڕاست بەکار بهێنین بۆ خۆ پاکردنـەوە)هـەروەها لەبەر فەرموودەکەی تری پێغەمبـەر(ﷺ) کە دەفـەرمووت (لا يمسكن احدكم ذكره بيمينـه و هويبـول ، ولا يتمسـح مـن الخلاء بيمينه )) [٦]

واتـە : قـەت نەکەن کەسێ لـە ئێوە بە دەسـتی ڕاسـتی عـەورەتی بگـرێ لـە کـاتی مـیز کردنـی . وە خـۆی پـاك نەکاتەوە لە پیسی بەڕاستەی) وە ئەگەر دەستی چەپەی بڕابوو یان شکانێکی تیا بوو یـان نەخۆشیەکی تیـابوو یـان هاوشێوەی ئەمانـە . ئەوکاتـە بـۆی هەیـە بەڕاسـتە

---

(٥ )رواه الترمذى . وقال حديث صحيح .

(٦ ) رواه مسلم .

خۆی پاك بکاتەوە لە بەر پێویستی ، وە هیچ نا شەرعی یەکی تیانی‌یە . وە ئەگەر بە بەردو بەئاو خۆی پاکردەوە ئەوا جاکتر و تەواو ترە .

وە لەبەر ئەوەی شەریعەت لەسەر ئاسانکاری و سووکی دامەزراوە . خوای گەورە عیبادەتەکانی سەر نا تەواوەکان سووك کردووە . بە گوێرەی نا تەواو یەکانیان و بیانووە کانیان بۆ ئەوەی توانای ئەنجامدانی پەرستنی ئەوەیان هەبێت بەبێ ناخۆشی و مەشەقەت .خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ وما جعل عليكم في الدين من حرج ﴾ (الحج : ٧٨ ). واتە خوای گەورە لە دین و دینداری دا ناخۆشی و قورسی نەحستۆتە تەسەرتان

وە دەفەرمووێ ﴿يريد الله بكم اليسر ولا يريد بكم العسر﴾ (البقرة : ١٨٥)

واتە : خودا ئاسانی و سوونی بۆئێوە دەوێت وەگرانی وقورسی و ناخۆشی ناوێت بۆ ئێوە

وە دەفەرمووێ : ﴿فاتقوا الله ما استطعتم﴾ (التغابن :١٦)

واتە : خوا پەرستی بکەن بە گوێرەی تواناتان .

وە پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرمووێ (اذا امر تكم بأمر فأتوا منه ما استطعتم )[7]

واتە : گەر فەرمانی شتێکمدا بەسەرتان ئەوە بە گوێرەی تاواناتان جی بە جێی کەن .

وە دەفەرمووێ (ان الدين يسر) واتە : دین ئاسانە و خۆشە .

جا نەخۆش ئەگەر نەتوانێ دەست نوێژ بگرێ بۆ خۆپاك كردنەوە لە بێ دەست نوێژی بچووك (الحدث الاصغر) یان نەیتوانی خۆی بشوات بۆ خۆ پاکرنەوە لە بێ نوێژی گەورە ( لەش گرانی — (الحدث الاكبر)لەبەر نە بوونی توانا یان لە ترسی زیاد بوونی نەخۆشیەکە یان دوا کەوتنی چاك بوونەوەکەی . ئەوا بۆی هەیە تەیمووم بکات . تە یممومیش ئەوەیە : دەستی بدا لە خۆڵی پاکی زەوی یەك جار پاشان دەستی بهێنێ بە دەموو چاویدا و بە هەر دوو دەستی لەبەر ئەم فەرموودەی خودا ﴿وَإِنْ كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا وَإِنْ كُنتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنكُمْ مِنَ الغَائِطِ أَوْ لَامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ مِنْهُ﴾ (المائدة :٦) .

---

(٧) رواه مسلم .

واتە : گەر لەش گران بوون (جنابـــة)ئـەوا خۆتـان پـاك بکەنەوە وە ئەگەر نەخۆش بوون یان لەسەفەر بوون یان چونـەلای ئـافرەت و ئاواتـان دەسـت نەکـەوت ، ئـەوا تـەیموم بکەن بـەگڵێکی پاك ، رووتان و دەستانی پـێ مەسح بکەن .

وە ئەوەی توانای بەکارهێنانی ئاوی نییە حوکمی ئەو کەسەی هەیە کە ئاوی دەست نا کەوێت لەبەر ئەم ئایەتە ﴿فـاتقوا الله مـا اسـتطعتم﴾ (التغـابـن ١٦). وە لەبـەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بە — عمار (رضی الله عنه) فـەرموو (انما یکفیـك ان تقـول بیـدك هکـذا ) واتـە : بـۆ تەیموم هەر ئەوەندەت بەسە ( یەك جار دەستی دا لە زەویەکەو پاشـان دەمـەو چاوی و دەسـتی پـی مەسـح کرد) ، وە دروست نییە تەیموم تەنها بە گڵێکی پاکژی بە تۆز . وە تـەیموم دروسـت نابـێ بـەبی نیـەت لەبـەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) (انمـا الا عمـال بالنیـات وانمـا لکل امرئ مانوی ) .

واتە : کردارەکان بەنیەتەکانە وە هەر کەسەو بە گوێرەی نیەتی خۆی لێ پرسینەوەی لە گەڵدا دەکرێت .

## نەخۆش بۆ پاکردنەوەی خۆی
## چەند حاڵەتێکی هەیە

١- ئەگەر نەخۆشیەکەی سووك بوو لە بەکارهێنانی ئاو هیچ ترسێك نەبوو بۆ لە ناو بردنی هەر ئەندامێکی لەش یان دروست بوونی نەخۆشیەکی گەورەتر و سامناك تر .. یان دوا کەوتنی چاك بوونەرەی . یان زیاد بوونی نازارەکانی یان کارێکی زۆر خراپ وە دروست بوونی سەر نێشەو ئێشی ددان و هاو شێوەی ئەمانە . یان لەوانە بوو کە دەتوانن ئاوی گەرم بەکار بهێنین و هیچ زیانێکی بۆی نی‌یە . وە ئەمە لەبەر ئەوەی ئاوی دەست دەکەوێ واجبە لەسەری بەکار هێنانی .

٢- وە ئەگەر نەخۆشیەکی هەبوو کە مەترسی لە دەست دانی گیانی هەبوو یان لە دەست دانی ئەندامێکی . یان پەیدا بوونی نەخۆشیەك کە ترسی لە ناو بردنی نەخۆشەکە . یان ئەندامێکی لێ دەکرا . یان لە دەست دانی سوود و بەرژەوەندیەك . ئا ئەمە بۆی هەیە تەیمووم بکات . لەبەر فەرموودەکی خوا ﴿ولا تقتلوا انفسكم ان الله كان بكم رحيما﴾ (النساء : ٢٩) .

واتە : خۆتان مەکوژن و بێ ئومێدبن لە رەحمی خودا .
بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێ بووردەیە .

٣- وە ئەگەر نەخۆشیەکی لە گەڵدا بوو کە بە هۆیەوە نەیدەتوانی بجوو لێتەوە وەکەس نەبوو ئاوەکەی بۆ بهێنێت . بۆی هەیە تەیمووم بکات وە ئەگەر نویموومی پێ نەدەکرا دروستە یەکێکی تر بۆی ئەنجام بدات . وە ئەگەر لەشی پیس ببوو یان جلەکانی یان جێگەکەی وە نە یدەتوانی پاکی بکاتەوە یان خۆی لێ پان بکاتەوە بۆی هەیە نوێژ بکات لەسەر ئەم خاڵەتە چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ ﴾ (التغابن :١٦) بۆی نییە نوێژ دوا بخات بە هۆی نەتوانینی خۆپاك کردنەوەی یان لادانی پیسی .

٤- هەر کەسێ برینێکی هەبوو یان شکانیك یان نەخۆشیەك بەکار هێنانی ئاو زیانی پێ دەگەیاند ئەگەر تووشی لەش گرانی (جنابە) هات بۆی هەیە تەیمووم بکات . لەبەر ئەو بەڵگانەی باسمان کرد وە ئەگەر دەیتوانی شوێنە ساغەکانی لەش بشوات ئەوا واجبە لەسەری بیشوات وە بۆ ئەوانی تری تەیمووم بکات .

٥- ئەگەر نەخۆش لە شوێنێکدا بوو نەئاوی تیا دەست دەلەکەوت وەنە گڵ . یان کەسی دەست نەکەوت ئەمانەی بۆ بهێنێت . ئەوا نوێژ دەکات لەسەر ئەم حاڵەی خۆی و بۆی نی یە نوێژە کە دوابخات چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ .

﴿ فاتقوا الله ما استطعتم ﴾ . (التغابن :١٦)

٦- ئەو نەخۆشەی تووش بووە بە نەخۆشی میزە چرکێ (سلس البول)یان بەردەوام دەرچوونی خوێن یان (با) وە چاك نەدە بۆیەوە بە چارەسەر کردنی ، پێویست دەکات لەسەری بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژێك بگرێت وە ئەوشوێنەی لەشەی بشوات کە میزە کە یان خوێنەکە بەری کەو تووە . یان جلێکی پاك بۆ نوێژ دانێت گەر بۆی دەکرێ چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ ماجعل علیکم في الدین من حرج ﴾ (الحج :٧٨)

وە ﴿یرید الله بکم الیسر ولا یرید بکم العسر﴾ ( البقرة ١٨٥) .

وە فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ)(اذا امرتکم بأمر فأتوا منه ما اسطعتم ) واتە : گەر فەرمانم پێدان ئەوا جێ بەجێی بکەن بە گوێرەی تواناتان .

وە دەبێ ئاگاداری خۆی بێت نەهێڵێت میزەکە یان خوێنەکە زۆر بلاوببێتەوە بە ناو لەشی وجلی و شوێنی نوێژ کردنی وە بۆی هەیە لە کاتی مانەوەی نوێژەکە نوێژ بکات و قورئان بخوێنێنەوە تا کانەکە تەواو دەبێت . کاتێك کاتەکە تەواو بوو واجبە سەر لە نوێ دەست نوێژێکی تری بۆ بگرێ . یان تەیمووم بگرێ گەر توانای دەست نوێژ گرتنی نەبوو .

چونکە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دا بە ئافرەتە خوێندارەکە (المستحاضة) کەوا بۆ هەموو نوێژێك دەست نوێژێکە تازەبگرێتەوە چونکە تووشی خوێنە چرکێ ببوو . وەگەر لە دوای دەست نوێژ گرتنی بۆ نوێژەکە کاتی نوێژەکەهێشتا مابوو ئەوا ئەگەر میزە کە هاتە خوارێ هیچ کار لە دەست نوێژەکەی ناکات وە ئەگەر شوێنێکی ، گەجی تێگیرا بوو پێویستی بەمانەوە هەبوو . ئەوا مەسح دەکات بەسەری لە دەست نوێژو خۆ شۆردندا . وە ئەوانی مردە شوات . وە ئەگەر مەسح کردن بەسەر شوێنی گەچەکە زیانی هەبوو یان شۆردنی دەور و بەری زیانی هەبوو بۆی کافیە ،

ئەوا تەنها تەیمووم کردن وە تەیمووم بەتاڵ دەبێتەوە بە هەموو ئەو شتانەی کە دەست نوێژ بەتاڵ دەکاتەوە . هەروەها بەتاڵ دەبێتەوە بە دەستکەوتنی ئاو و توانای بەکارهێنانی

واللہ اعلم

## چۆنیەتی نوێژی کەسێکی نەخۆش

ئەهلی عیلم کۆڕان لەسەر ئەوەی هەرکەسێ نە توانێ بە هەڵسانەوە نوێژ بکات ، بۆی هەیە بەدانیشتنەوە بیکات گەر نەیتوانی بە دانیشتنەوە بیکات . ئەوا بۆی هەیە لەسەرلا رووە و قیبلە نوێژ بکات وە چاکتروایە لەسەر لای ڕاستی بێت وە گەر توانای نوێژکردن لەسەر لایشی نەبوو بۆی هەیە نوێژبکات بە پاڵکەوتنەوە رووە و قیبلە . وە ئەمەش لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێك بە عمران بن حصین – رضی اللہ عنه – فەرموو (صل قائماً ، فإن لم تسطیع فقاعدا فإن لم تسطیع فعلی جنب) رواه البخاری و زاد النسائي ( فأن لم تستطيع ممستلقياَ ) .

واتــه : نوێــژ بــه پێــوه بکــه ، گــەر هــەر نــەتوانی بــه دانیشــتنەوه ، گــەر هــەر نــەتوانی لەســەرلا ) نەسـائی زیادی کردووه (گەر هەر نه توانی به پاڵکەوتن ) .

وه هــەر کەسـێ توانـای وەسـتانی هــەبێت بــەڵام توانـای رکوع بردن و کرنووش بردنی نەبێت . ئەوا وەستانەکەی لەسـەرلا نـاچێت . بـەڵکو نوێــژ بــه پێـوه دەکـات بـۆ رکوعیـش ئیشــارەت دەکـات پاشــان دادە نیشــێت و ئیشارەت ئەکات بـۆ کرنـووش . چونکـه خـوای گـەورە دەفەرمووێ ﴿ وقوموا لله قانتين ﴾ (البقرة : ٢٣٨) .

وه لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) که فەرمووی (صلِّ قائماً) وه له بەر گشتی یەتی مەبەستی ئەم ئایەته .

﴿ فاتقوا الله ما استطعتم ﴾ (التغابن : ١٦)

وه ئەگــەر نەخۆشــی هــــەبوو لــــه چــاوی . وەچــــەند پزیشکێکی متمانه پێ کراو پێیان ووتبوو چاك نابیتەوه ئیلا ئەگەر به پالاکەوتن نوێژت کرد . ئەوا بۆی هەیه به پاڵکـەوتن نوێـژ بکات وه هـەر کەسـێ نـەیتوانی رکـوع و کرنووش ببات تۆزێ سەری دا دەچەمێنێتەوه . وه دەبێ کرنووشـەکەی زیـاتر چەمینـەوەی تیـا بێـت وه ئەگــەر نـەیتوانی کرنـووش ببـات و توانــی رکــوع ببــات ئــەوا

رکوعەکـــە دەبـــات و بـــۆ کرنووشـــەکەیش . بەســـەری ئیشارەتی بۆ دەکات .

وە ئەگەر نەیتوانی لەرکوعدا تەواو دا بچەمێتەوە . یان پشتی خۆی لە خۆیدا لە شێوەی چەمانەوەدا بوو ، ئەوا لەرکوعەکەیدا زیاتر دادەچەمێتەوە . وە لە کرنووشیشدا رووی زیاتر نزیك دەخاتەوە لە زەوی وەك لەرکوعدا هەتا بۆی بکرێ .

وە هەر کاتێك نەخۆش لە ناو نوێژەکەدا توانای ئەوەی بـۆ دروسـت بـوو کـە لـە سـەرەتاوە نـەیدەتوانی لـە هەستانەوە و رکوع و کرنووش و ئیشارەت کردن ، ئەوا ئـەنجامی ئـەدات و لەســەر ئـەوەی کردوویــەتی لـــە نوێژەکەی ، نوێژەکەی پێ تەواو دەکات وە هەرکاتێك نەخۆش یان غەیری ئەو خەوت لە کاتی نوێژدا یان لە بیری چوو .. ئەوا واجبە لەسەری لەکاتی هەڵسانی لە خـەو نوێژکـەی ئـەنجام بـدات . یـان لـە کـاتی بـیر کەوتنەوەی . نەوەك چاوەڕێ بکات تا کاتی نوێژەکەی تـر دێـت و ئـەنجامی بـدات . لەبـەر ئـەم فـەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)(من نام عـن صـلاة او نسـيها فليصليـها متى ذكرها ، لاكفارة لها إلا ذلك ، وتـلا قولـه ﴿وأقـم الصلاة

لذكرى﴾ (طه :١٤) واتە : كەسى لە كاتى نوێژێك دا خەوت یان لەبیری چوو با نوێژەكەی بكات هەركاتێك بیری كەوتەوە با بەجێی بگەیەنێ هیچ كەفارتێكی نیەیە جگە لەمە پاشان ئەم ئایەتەی خوای گەورەی خوێندەوە نوێژ ئەنجام بدە بۆ یادی و بیركەوتنەوەی من وە دروست نیەیە نەكردنی نوێژ لە هیچ حاڵەتێكدا .

بەڵكو پێویستە لەسەر كار پێ سپێردراو (مكلف) زیاتر ئاگادار و بە پەرۆشی نوێژەكانی ببێت لە ڕۆژانی نەخۆش بوونی وەك لەو ڕۆژانەی تیایدا تەندروستی چاكە ، بۆی نیەیە نوێژی فەرزێك ئەنجام نەدا تا كاتەكەی دەر دەچێت ، ئەگەر چی نەخۆشیش بێت . مادەم ئەقل و هۆشی تیا مابوو بەڵكو پێویستە لەسەری لە كاتەكانی خۆی ئەنجام بدات بەگوێرەی توانای جا ئەگەر وازی لێ بهێنێت بە ئەنقەست لە كاتێكدا عەقل و هۆشی هەیە وموكەلەفە . وە توانای ئەنجامدانی یان بە ئیشارەت هەیە . ئەوا تاوانبارە . وە كۆمەڵێك لە زانایان بۆ چوونیان وایە كە بەمە كافر دەبێت . لەبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) (العهد الذي بيننا و بينهم الصلاة

فمن تركها فقد كفر)[8] . واتە: ئەو پەیمان و کارەی کە لە نێوان ئێمە و کافران دا هەیە واتە خاڵی لێکجیا کردنەوەمان . نوێژە . هەرکەسێ نەیکات کافرە .هەروەها لەبەر ئەم فەرموودە (رأس الأمر الاسلام ، وعموده الصلاة ، و ذروة سنامه الجهاد في سبيل الله) واتە: سەری کارەکان تە سلیم بوونە بەفەرمانەکانی خوادا . وە کۆڵەگەو پایەکەیشی نوێژە . وە لووتکەی هەرە بەرزە کەی . جیهاد وشەڕ کردنە لە پێناوی خوادا . هەروەها لەبەر ئەم فەرموودە : (بين الرجل و بين الشرك و الكفر ترك الصلاة). (رواه البخارى ومسلم )

واتە : لە نێوان مرۆڤ و نێوان شیرك و کوفردا وازهێنانە لە نوێژ ) ئەم بۆ چوونەیش ڕاسترە لەبەر ئەو ئایەتانەی سەبارەت بەم باسە دابەزیون وە لەبەر ئەو فەرموودانەی باسکران . وە ئەگەر نەیتوانی هەموو نوێژەکان لە کاتی خۆی یدا ئەنجام بدات ، ئەوە بۆی هەیە کۆیان بکاتەوە (جمع) وەك ئەوەی‌نیوەڕۆ و عەسر بە یەکەوە بکات ، وە مەغریب و عیشا بە یەکەوە بکات بەکۆ کردنەوەی پێش خستن (جمع تقديم) یان کۆ کردنەوەی دوا خستن (جمع تأخير) هەر چۆنێك بۆی

---

(8) رواه مسلم

گونجا ئەگـەر حـەزی کـرد عیشـای پێـش خسـت و لەگـەڵ مـەغریب داکردی یـان مـەغریبی دواخسـت و لەگەڵ عیشـادا کردی . یـان عەسری پێش خسـت و لەگەڵ نیوەڕۆدا کـردی وە یـاخود نیـوەڕۆی دوا خسـت و لەگەڵ عەسـر ئـەنجامی‌دا . بەڵام بەیانی نە لەگەڵ ئەوەی پێشی وە نەگەڵ ئـەوەی پاشی کۆ دەکرێتـەوە چونکـە . کا تەکـەی نوێـژی بـەیانی دابـڕاوە لەکاتی نوێژەکـەی پێشـی (عیشـا) وە لـە نوێژەکـەی پاشـی (نیـوەڕۆ) (٩) داواکـارم لـە خـوای پـەروەردگار کەشـیفای نەخۆشانی موسوڵمانان بدات وە لە تاوانەکانیان خۆش بێت . وەمنەت بکا بەسەرمانەوە بە لێبوردن و شیفاو سەلامەتی لە دنیاو قیامەت .

انه جواد کریم .

وصلی الله علی نبینا محمد ، وعلی اله واصحابه اجمین و اتباعه بأحسان الی یوم الدین

المفتي العام للمملكة العربية السعودية ورئيس هيئة كبار العلماء وادارة البحوث العلميه والافتاء. عبدالعزيز بن عبدالله بن باز

---

(٩ ) چونکە نوێژی عیشا تا نیوەی شەو دەمێنێت ئیتر نیوەکەی تری شەوکاتی هیچ نوێژێکی فەرزی تیانی‌یە . وە نوێژی بەیانی تـا خـۆر هـەڵاتن دەمێنێـت . ئیـتر لـە خـۆر هەڵاتنـەوەتا پێـش نیوەڕۆکانی هیچ نوێژنی‌یە .

## چەند فەرموودەیەك لە بارەی فەزڵی نەخۆش کەوتن تووشبون بە بەڵاو موسیبەت و ئارام گرتن لەسەری

١-لە (ابي هريرة) وە (ابي سعيد الخدري) رضى الله عنهما — لە پێغەمبەر(ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (مايصيب المسلم من نصب . ولا وصب ، ولاهم ، ولاحزن ، ولا اذى ولاغم . حتى الشوكة يشاكها الاكفر الله بها خطاياه) واتە : هیچ موسوڵمانێك نییە تووشی ناخۆشی و ماندوو بوون بێت یان نەخۆشی یان خەم یان دڵتەنگ بوون یان عەزیەتێك یان خەفەتێك هەتا دڕکێك کە ئەچێت بە لەشی دا ئیلا خوای گەورە بەهۆی ئەمانەوە لە تاوانەکانی کەم دەکاتەوە .

٢- لە عائیشە (رض الله عنها) دەفەرموێ : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : (ما من مصيبة تصيب المسلم الا كفر الله بها عنه حتى الشوكة يشاكها) واتە : هیچ موسوڵمانێك نیيە کە تووشی موسیبەتێك بێت . ئیلا خوای گەورە لە تاوانەکانی خۆش دەبێت هەتا ئازاری دڕکێکیش کە دەچێت بە لەشیدا .

٣- لە (ابن مسعود)ە وە — رضی الله عنـــه- دەفەرمووێ :
پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی : (ما من سلم یصیبه اذی من مرض فما سواه الاحط الله به من سیئاته کمـا تحـط الشـجرة ورقـها)
واتە : هیچ موسوڵمانێك نی‌یـە کـە تووشـی عەزیـەت و ئـازار دەبێـت یـان نەخۆشـیەك و غـەیری ئەمـەش لـە ناخۆشـی ئیـلا خـوای گـەورە بەهۆیـەوە لـە تاوانـەکانی دەوەرێنێت . وەك چۆن درەخت گەڵاکانی هەڵدەوەرێت .
٤- لـە (جابر)وە —رضـی الله عنـــه- کـەوا پێغەمبـەر(ﷺ) چووەلای (ام السائب)فەرمووی : (مالك یا ام السائب تزفـین ؟ قالت الحمی لا بارك الله فیها . فقال (لاتسـبي الحمـي ، فأنـها تذهب خطایا بني ادم کما یذهب الکیر خبث الحدید) .
واتە : ئەوە چی‌یە نەی ( ام السائب ) بۆ ئاوا ؟ فەرمووی : بـــەهۆی (تـــا)وە خـــودا بەرەکـــەتی تێنـــەکات .
پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی نەکـەی حنێـو بـە (تـا) بدەیـت چونکە بەڕاسنی(تا) مرۆڤ پاك دەکاتەوە لە تاوانەکان وەك چۆن ئاگر ئاسن پاك دەکاتەوە لە ژەنگ .
٥- وە لـە (ام العـلاء)- رضـی الله عنـــها — دەفـەرمووێ : پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی کردم لەوکاتـەی نـەخۆش بـووم فەرمووی : (ابشري یا ام العلاء ، فأما مرض المسلم یذهب الله

به خطایاه كما تذهب النار خبث الذهب والفضة) واته : موژدەت لێبێت نەی(ام العلاء)بەراستی نەخۆشی موسوڵمان خوای گەورە تاوەنەکانیپێ دەسڕێتەوە . وەك چۆن ئاگر زێر و زیو پاك دەکاتەوە لە پیسی و ژەنگ .

٦- (ابي هريرة)ە وە -رضى الله عنه- دەفەرمووێ : پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ما يزال البلاء بالمؤ من و المؤمنة في نفسه و ولده وماله حتى يلقى الله وما عليه خطيئة) . واته بەردەوام ئیمانداران لەژن وپیاو تووشی ناخۆشی دەبن لە گیانی خۆیان و منالْ و ماڵیان هەتا دەگاتەوە خوای گەورە و هیچ تاوانێکی نەماوە .

٧- وەلە (سعد بن ابي الوقاص) -رضى الله عنهما- دەفەرمووێ پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی (ما يبوح البلاء بالعبد حى يتركه يمشي على الارض و ماعليه خطيئة) واته : ناخۆشی بەردەوام تووشی بەندە دەبێت هەتا کاتێك وازی لێ دەهێنێت ئەم بەندە لەسەر زەوی دەڕوات و هیچ تاوانێکی لەسەر نییە .

٨- وە لە (عائيشه)ە وە -رضى الله عنها- دەفەرمووێ : بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : {ما من مسلم

یشاك شوكه فما فوقها الا كتبت له بــها درجـة ، ومحيـت عنـه خطيئة} واته : هیچ موسوڵمانێك نییه كه دڕكێك ئەچی به لەشیدا تا گەورەترین ناخۆشی . ئیلا بەهۆی ئەمەوە . خـوای گــەورە پلەیــەکی بــەرز دەکاتــەوەو تــاوانێکی دەسڕێتەوە .

١٠- وەله (ابی سعید الخدري)ە وە –رضــی الله عنـه- کـەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (صــداع المؤمـن ، او شــوكة يشاكها ، اوشیء یؤذیه ، یرفعه الله بها یوم القیامة درجة و یكفر ذنوبـه ) واتـه : سەرئێشەیەکی ئیمـاندار یـان درکێـك کـە دەچی به لەشیدا . یان شتێك كه ئازاری بدات . ئـەوا خوای گەورە بەهۆی ئەوەوە پلەیەکی بەرز دەکاتەوە له ڕۆژی دوایی وە له تاوانەکانیدەسبڕێتەوە .

برا و خوشکی نەخۆش :

ئەم پۆله فەرموودە ڕاست و بۆن خۆشانەی پێشکەشمان کـردی بەڵگـەی گـەورەی پاداشـتیتۆیه لـەلای خـودا ، ئەگەر تۆ سەبرو ئارام بگریت لەسەر نەخۆشی یەکەت . وە پێشوازی له قەدەری خـودا بکـەی بـه مـل کـەچی و تەسلیم و ڕازی بوون بێ ئەوەی بێ ئۆقرەیی و ئارامی و تورەیی بنوێنیت جا بی ئۆقرەیی و توورە بوون و گلەی

کردن چی سوودێکی دەبێت بۆت ؟ هیچ سوودێکت پێ ناگەیێنێ . بەلکو تەنانەت ئیش و ئازارەکانت و بێ هێزی و ماندوویت زیاتر دەکات چەندین جاری ئەو حاڵەی کە تیادا سەبرو رەزامەندی دەردەبڕی . جا ئاگادار بەو سوپاسی خودا بکە — براو خوشکی موسڵمان — لەسەر ئەم نیعمەتەی کە پێی داوی . تا تاوانەکانتی پێ بسڕێتەوە وە لە چاکەکانت زیاد بکات . وە لە پلەو پایەت بەرزبکاتەوە .

ئەی براو خوشکی نەخۆش لە سوودەکانی بەڵاو نەخۆشی ، بۆ مرۆڤ روون دەکاتەوە کە چەند بێ هێزە . هەرچەند و چۆن بێت هێزەکەی ، هەرچەندە چەند و چۆن بێت سامانەکەی . ئەم هەستەی بیردەخانەوە لە کاتی نەخۆشی بە پەروەردگاری دەوڵەمەندی کە ئەو پەڕی تەواوەتی هەیە لە دەوڵەمەند یەتی . ئەو پەروەردگارە بەهێزەی کە ئەو پەڕی هێزو دەسەڵاتی هەیە . یەکسەر پەنا ئەباتە پەروەردگاری لە پاش ئەوەی لێی بێ ئاگابووە . وە واز لە دژایەتی کردنی دەهێنێت بە تاوان کردن لە دوای ئەوەی تیایدا ڕۆچوو بوو .

**براو خوشکی نەخۆش :**

وەلە سوودەکانی نەخۆش بوون ئەوەیە : خودا ئەو نیعمەتانەی خۆی لەسەرت پیشانت دەدات وەك ئەوەی لە مەوپێش هەر نەتبینیبێت ، لە کاتی نەخۆشیدا مرۆڤ هەست دەکات بە هەستێکی ڕاستە قینە ، بە نیعمەتی لەش ساغی وە هەست بەو کەمتەرخەمیەی دەکات بەرامبەر ئەم نیعمەتەی خوا .کە چەندان ساڵە پێی بەخشیوە . لە گەڵ ئەمەش دا هیچ حەقێکی خوای گەورەی تیا بەجێ نەگەیاندووە . پاشان بەڵێن دەدات بە پەروەردگاری کە لەمەودوا سوپاس و شوکرانە بژێری نیعمەتەکانی خودا بکات و ئارام بگرێ لەسەر ناخۆشیەکانی – نامەوێت زیاتر درێژە بدەم بە باسەکە ئەم فەرمووده ڕاستانەی بۆم باسکردی سوودی تەواوی تیایە لە بارەی سوودەکانی نەخۆشی و بەلاو موسیبەت بۆ ئیمانداری ئارامگر .

## چارەسەر کردنی نەخۆشی
## بە دوعاو قورئان

براو خوشکی‌نەخۆش : پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی پی داوین . کە هەموو دەردێك ، دەرمانی هەیە وە گەورەترین دەرمان و چاکترینی بۆ نەهێشتنی نەخۆشی و لەناو بردنی ، دەرمانی پەروەردگاری یە . لە ئایەتەکانی قورئان و دوعاکانی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿ وننزل من القرأن ما هوشيفاء ورحمة للؤمنين ﴾ (الاسراء :٨٢) .

واتە : ئەم قورئانە مایەی شیفاو رەحمەتە بۆ ئیمانداران وە دەفەرمووێ ﴿ قل هو للذين امنوا هدى وشفاء ﴾ (فصلت : ٤٤) .

واتە : ئەی محمد(ﷺ) بڵێ . ئەم قورئانە مایەی هیدایەت و رێنمووی و شیفایە بۆ ئیمانداران .

ئێستاش فەرموو لەگەڵ هەندێ لەو دوعایانە کە دەتوانی بەسەر خۆت دا بیخوێنی یان غەیری خۆیشت بۆت بخوێنێ .

١- خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) (جارێك یان حەوت جار) .

٢- خوێندنەوەی (المعوذتين) (قل اعوذ برب الفلق — قل اعوذ برب الناس) سێ جار .
٣- دەستی ڕاستی دەهێنێ بەسەر لەشیدا وبڵێت (اذهب البأس رب الناس ، واشف انت الشافي لاشفاء الاشفاؤك ، شفاء لايغادرسقماً )
٤- وتنی (اسأل الله العظيم رب العرش العظيم ان يشفيك) حەوت جار .
٥- وتنی (بسم الله ارقيك من كل شيئ يؤذيك ، من شر كل نفس او عين حاسد الله يشفيك . باسم الله ارقيك) .
٦- دانانی دەست لەسەر ئەو شوێنی ئازارەکەی تیایە . لە لەش پاشان سێ جار بڵێت (بسم الله) پاشان بڵێت (اعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما اجد واحاذر) حەوت جار .
٧- وتنی (اعوذ بكلمات الله التامات من شر ما خلق ) .
٨- وتنی (اعوذ بكلمات الله النامات من غضبه وعقابه و شر عباده و من همزات الشيا طين وان يحضرون ) .
٩- وتنی (اعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة ومن كل عين لامة) .

١٠-ووتنی ( بسم الله الذی لایضرمع اسمه شیئ فی الارض ولا في السماء وهو السميع العليم ) سێ جار

**لە کۆتایدا داواکارم لە پەروەردگاری خاوەن عەرشی مەزن شیفات بدات وە نیعمەتی لەش ساغی و خۆشی پێت ببەخشێت**

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

**چاوەڕوانی ئەم نامیلکەیە بن**

**٢٠٠ ئامۆژگاری بەنرخ و جوان**

**بۆ خوشکانی موسڵمان**

انشاء الله

لەمن دەپارێزرێ تەنها بەمافی ئیسلام نەبێت وحسابی ئەوان لەلای خودایە) .

وە دەفەرموێت : ( إنّ حوضي لأبعدُ من أيلةَ من عدن ، وَالّذي نفسي بيَده لآنيَتَهُ أكثرُ مِن عَدَدِ نُجوم السّماء. ولَهُوَ أشَدُّ بَياضاً مِنَ اللّبَن ، وَأحلىٰ مِنَ العَسَل ، والّذي نفسي بِيَدِهِ إني لأذودعنه كما يَذود الرّجل الأبِل الغَريبَة عَن حوضِه ، قالوا يارسول اللهِ أوَتَعرفنا ؟ قال : نعم ، تردون علىٰ الحَوض غُرّاً مُحجّلينَ مِن آثارَ الوضوءِ ، لَيست لأحدٍ غيركم ) (رواه مسلم) •

واتە : ( حەوزەكەی من فراوانترو دورترە لە ئەیلە لەعەدەنەوە ، سوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە پەرداخەكانی زۆرترە لەژمارەی ئەستێرەكانی ئاسمان ، وەسپی ترە لەشیر و شیرینترە لە هەنگوین وەسوێند بەو خوایەی نەفسی منی بەدەستە من خەڵكی لێ دوور دەخەمەوە هەروەكو چۆن پیاو حوشتری نامۆ لەحەوزەكەی دوور دەخاتەوە . وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە دەناسیتەوە ؟ فەرمووی : بەڵێ دێنەسەر حەوزەكە بۆ لام بەنارچەوان و لۆقی سپییەوە

بـەهۆی شـوێنەواری دەسـت نوێژەكانتانـەوە . ئـەم سیفەتەش بۆ ئێوەنەبێ بۆ كەسی تر نی‌یە لەئومەتەكان) دەسا ئەی نوێژنەكەر ئەبێ هەڵوێستت چی بێ لەو ڕۆژە نارەحەتـەدا كاتـێ پێغەمبـەر ﷺ لەحەوزەكـەی دوورت دەخاتەوە لەبەر نوێژ نەكردنت. چونكە شوێن كەوتوانی خۆی ئەناسێتەوەبەهۆی شوێنەواری دەست نوێژیان داو تۆش شوێنەواری دەست نوێـژت نی‌یـە چونكـە نوێـژت نـەكردووە؟! دەی باشـە بـەم هـەموو دووركەوتنەشـتەوە دەتەوێ بچیتە بەهەشت ؟!.

وە خـوای گـەورە نـەفرەتی لەشـەیتان كـرد و لەڕەحمـەتی خـۆی دەری كـرد و لـە ڕۆژی دوایـی دا بەهەمیشەیی لەدۆزەخ دا یە چونكە خۆی بە زل زانی و سـەجدەی بۆ ئـادەم نـەبرد كاتـێ خـوا فـەرمانی پـێ‌كرد ﴿ وإذ قلنـا للملائكة اسجدوا لآدم فسـجدوا إلا إبليـس أبـى واستكبر وكان من الكافرين﴾ دەی سا ئـەبێ ئەوكەسـەحاڵی چۆن بێ كەسەجدە بۆ خوا نابات و سـەرپێچی دەكات ؟ لەكاتێكدا خوا دەفەرموێت :

﴿ وماخلقت الجن والأنس إلا ليعبدون﴾ وە دەفەرموێت :
﴿قل لعبادي الذين آمنوا يقيموا الصلاة ﴾ وە(عومەری كوڕی
خەططاب (ڕەزای خوای لێ بێت ) كاتێ هۆشی هاتەوە
دوای ئەوەی خەنجەرەكەیان لێدا كە پێوەی كۆچی
دواییی كرد ؟ فەرمووی :ئایا خەڵكی نوێژیان كرد؟
ووتیان بەڵێ ،فەرمووی : (لا حَظَّ في الأسلامِ لِمَن تَرَكَ
الصَلاة) واتە:( بەشی نیە لەئیسلامەتی ئەو كەسەی واز
لەنوێژ دەهێنێت ).

وەهاوەڵەكانی پێغەمبەرﷺ نەكردنی هیچ
كردەوەیەكیان بەكوفر نەدەزانی جگە لەنوێژ ، وە(ابن
مسعود) دەفەرموێت : (مَن تَرَكَ الصَلاة فَلا دِينَ لَهُ) واتە :
(ئەوەی واز لەنوێژ دێنێ دینی نییە ).

وە(ابو الدَرداء) دەفەرموێ : (لا إيمانَ لِمَن لاصَلاةَ لهُ )
واتە:( ئەوەی نوێژ نەكات ئیمانی نییە ).

وە (الحافظ المنذري) دەفەرموێ : (كۆمەڵێك ڕا لە
هاوەڵان هەیە لەسەر بەكافر زانینی ئەوكەسەی واز
لەنوێژەكەی دێنی تا هەموو كاتەكەی دەڕوا ) لەوانە :
(عومەری كوڕی خە ططاب و أبوهریرە و عبدالله ی

كوڕی مەسعود وعبدالله ی كوڕی عباس و مەعاذی كوڕی جەبەل و جابری كوڕی عبدالله وابو الدرداء و عبدالرحمن بن عوف و غەیری ئەمان }(ڕەزای خوایان لێبێت) .

وە (ابن القیم )دەفەرموێ : ( وە لە هاوەڵانەوە نەهاتووە بەپێچەوانەی ئەمە ) وە وتەیەكی (ئیمام أحمد) هەیە كە هەركەسێ بانگ بكرێت بۆ نوێژ لەكاتی خۆیداو بڵێ نوێژ ناكەم و خۆی لێ بێ ئاگا بكات تا دەفەوتێ واجبە بكوژرێ ، واتە لەدەوڵەتی ئیسلامی دا .

وە لەم زەمانەدا فتوا دراوە لەسەر مورتەدی نوێژ نەكەرو كوژرانی و جیا كردنەوەی لەهاوسەرە موسڵمانەكەی . دەی چاوەڕێی چ چاكەیەك لە نوێژ نەكەر دەكرێ ؟•

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( مَن تَرَكَ صَلاةَ العَصرِ فَقَد حَبِطَ عَمَلُهُ ) ( البخاری ).. واتە : {ئەوەی وازی لەنوێژی عەسر هێنا كردەوەكانی پوچەڵ دەبنەوە }. دەسا ئەگەر ئەمە حاڵی ئەوكەسە بێت ، ئەبێ حاڵی ئەو كەسە چی بێت كە هیچ نوێژێك ناكات و ئەبێ حاڵی چۆن بێت لەو

ڕۆژەدا كە لە بەردەم خوای دەستەڵاتداری ئاسمانەكان و زەوی دا ڕادەوەستێنرێت ؟•

دەسا نوێژ نەكەر مەخەڵەتێ بەو تەمەنە كەمەی كە هەتە یان بە گەنجێتی‌یەكەت چونكە مردن ڕێگەت پێ دەگرێ ئەگەر چی تەمەنت درێژە بخایەنێ . وە وەك ئەوكەسە مەبە كە ناتوانێ سەرپێچی ئارەزووی خۆی بكات و لە سەرسەختی خۆی بەردەوامە و نایەوێ ئایەتەكانی خوا ببیستێ و بەردەوامە لەسەر یاخی بوون هەروەك ئەوەی گوێی لێ نەبوبێ ﴿ ویل لكل أفاك أثیم . یسمع آیات الله تتلى علیه ثم یصر مستكبرا كان لم یسمعها فبشره بعذاب ألیم ﴾

## حوكمی نوێژ نەكەر

خوێنەری ئازیز ، ئەمە دەقی ئەو پرسیارە یە كە ئاراستەی جەنابی( شێخ محمد بن صالح العثیمین ) كرا لەبارەی نوێژ نەكەرەوە و وەڵامەكەی بەهیوای سوود وەرگرتن :

پرسیار : ئایا پیاو ئەبێ چی بكات ئەگەر فەرمانی بەكەس و كارەكەی كرد كە نوێژ بكەن ، بەڵام گوێیان بۆ نەگرت ، ئایا لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە لەوماڵەدا و تێكەڵاویان دەكات یان لەماڵ دەچێتە دەرەوە؟٠

وەڵام : ئەگەر ئەو كەس و كارەی هەرگیز نوێژیان نەدەكرد ئەوە بێ باوەڕن ، هەڵگەڕاوەن ، دەرچوون لەئیسلام و جائیز نییە كە لەماڵدا بمێنێتەوە ، بەڵام لەسەری پێویستە كە بانگەوازیان بكات و زۆر بەردەوام دووبارەی بكاتەوە لێیان بەڵكو خوا ڕێنموونیان بكات ، چونكە نوێژنەكەر كافرە (پەنا بەخوا) بەبەڵگەی قورئان و سوننەت و وتەی هاوەڵان و بۆچوونی ڕاست .

لەقورئاندا: وتەی خوای گەورە لەبارەی موشریكەكانەوە دەفەرموێ :﴿فإن تابوا وأقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فإخوانكم في الدين﴾ ئایەتەكە ئەوە دەگەیەنی ( كە ئەگەر وانەكەن ئەوابراتان نین ، وەنەفی برایەتی دینی ناكەین بەهۆی یاخی بوون و تاوان ئەگەر چی گەورەش بێ ، بەلا م نەفی دەكەین لەكاتی دەرچوون لەئیسلام ).

لەسـوننەت دا: فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ : { بين الرّجل وبين الكفر والشرك ترك الصّلاة } کە چەسپاوە لە(صحيحى موسليم)دا هاتووە ، وەفەرموودەیەکی تر لە بورەیدەوە ( ڕەزای خوای لێبێ) کە لە (سونەن)دا هاتووە { العهدُ الذى بيننا وبينهم الصّلاة فمن تركها فقد كفر} واتە : ( ئەو پەیمان و جیاوازی‌یەی لەنێوان ئێمەو بێ بڕواکاندایە نوێژە هەرکەس وازی لێبێنێت کافر بووە).

لەووتەی هاوەڵاندا : پێشەوای ئیمانداران (عومەر) (ڕەزای خوای لێبێت ) فەرموویەتی : (( لاحظّ فى الأسلام لمن ترك الصّلاة )) وە (الحظّ)واتە:{بەش و نسیب لێرەدا بە (نَكِـرَة ) هاتووە بەبێ (الف و لام ) لەمڕێڕەوە نەفی‌یەکەیەوە } •

کەواتە گشتی‌یەو نەکەم نەزۆر بەشی نی‌یە لەئیسلام دا ئەوکەسەی واز لە نوێژ بێنێ .

وە (عبد الله ی کوڕی شقیق )دەفەرموێ : (هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ شتێکیان نە دەبینی لە کردەوەکاندا کە نەکردنی کوفر بێت جگە لەنوێژ ).

لەلایەنی بۆچوونی راستیشەوە/ ئەوتری : ئایا ئەچێتە ئەقڵەوە كە پیاوێك بەئەندازەی مثقالە زەرەیەك لەخەردەل لەئیمان لەدڵیدا بێت وگەورەیی نوێژو گرنگێتی لەلایەن خواوە پێی بزانێ و پاشان پارێزگاری نەكردنی بكات؟.

ئەمە شتێكە ناگونجێ، وەكاتێ كۆڵیمەوە لەو بەڵگانەی كەئەوانەی پێیان وایە نوێژ نەكەر كافر نابێ دەیكەنە بەڵگە ، بینیم كە ئەوبەڵگانە لەچوار شت تێ ناپەرێت :

١ـ یان ئەوەتا ئەصلەن بەڵگەی لەسەر نییە .

٢ـ یان بەسراوەتەوە بەوەسفێكەوە كە لەو كاتەدا نوێژ نەكات هیچی لەسەر نییە.

٣ـ یان ئەو بەڵگەیە بەسراوەتەوە بەحاڵەتێكەوە كە ئەبێتە عوزر بۆ كەسێك ئەو نوێژە تەرك بكات.

٤ـ یان ئەوەتا گشتییەو بە فەرموودەكانی كافر بوونی نوێژ نەكەر تایبەت كراوە.

وەئەگەر روون بوویەوە كە نوێژ نەكەر كافرە ئەوا حوكمەكانی هەڵگەراوە(مُرتَد)ی بەسەردا ریز دەبێ ، وە

لە دەقەكاندا نەهاتووە كە نوێژ نەكەر ئیمانداره یان ئەچێتە بەهەشتەوە یان ڕزگاری ئەبێ لە ئاگر یان لەم شتانەی كە بیانومان بۆ درووست بكات تا تەئویلی ئەو كوفرە بكەین كە ئەدرێ بەسەر نوێژ نەكەردا و بڵێین : ئەو كوفرەی نیعمەتە یان كوفرێكی بچووكە .

## وە لەو حوكمانەش :

یەكەم : درووست نی‌یە كە ژنی بدرێتێ وەئەگەر عەقدی بۆ بەسترا لە كاتێكدا نوێژی نەدەكرد ئەوا نیكاحەكەی بەتاڵەو دانامەزرێ و ژنەكە بۆی حەڵاڵ نی‌یە،بەپێی ووتەی خوای گەورە لەبارەی ئافرەتە كۆچەریەكانەوە ﴿فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ ، لَا هُنَّ حِلٌّ لَهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ﴾ (الممتحنة).

دووەم : وە ئەگەر نوێژی تەرك كرد لەدوای بەستنی عوقدەكە بۆی ، ئەوا نیكاحەكەی هەڵدەوەشێتەوە و ئافرەتەكە بۆی حەڵاڵ نابێ .. بەپێی ئەو ئایەتەی لەپێشەوە باسمان كرد ، لەسەر ڕوونكرنەوەی زانراو

لەلای ئەهلی عیلم لەنێوان ئەوەی كە ئەمە پێش چوونەلای خێزانەكەی بێت یان دوای ئەوە بێت .

سێیەم : ئەم پیاوەی كە نوێژ ناكات ئەگەر گیانلەبەرێكی سەربڕی ئەوا سەربڕاوی ناخورێ لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی حەرامە ، وە ئەگەر جولەكە یان گاور سەری بڕێ ئەوە حەڵاڵە بۆ ئێمە كە بیخۆین (پەنا بەخوا) كەواتە سەربڕاوی دەستی ئەم پیس ترە لەسەربڕاوی گاورو جولەكە.

چوارەم : حەڵاڵ نییە كەبچێتە ناو مەككە وە یان سنووری حەرەمەكەی بەپێی وتەی خوا ﴿ یاأیها الذین آمنوا إنما المشركون نجس فلا یقربوا المسجد الحرام بعد عامهم هذا﴾ .

پێنجەم : ئەگەر یەكێك لەنزیكەكانی مردن ئەوە بەش و مافی نییە لەمیراتەكەیدا ، خۆ ئەگەر پیاوێك مردوو كوڕێكی نوێژ نەكەر ی هەبوو واتە: پیاوەكە نوێژ ئەكات و كوڕەكەی نوێژ ناكات ) وەئامۆزایەكی دووری بەجێ هێشت ، كامیان میراتی بەرئەكەوێ ؟ئامۆزا دوورەكەی بەری ئەكەوێ بەڵام كوڕەكەی بەری ناكەوێ بەپێی

فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ : ( لايَـرِثُ المُسـلِمِ الكـافِرَ ولاالكـافِرُ المسـلِم ) (متفق عليه) ... واتـە: { نـە موسـڵمان میراتی کافر دەگرێ ونە کافر میراتی موسڵمان دەگرێ }

وە بەپێی فەرموودەی :{ اَلحِقوا الفَرائِضَ بِاهلِها ، فما بَقي فلأولىٰ رجل ذكـر } (متفق عليه) . وەئەمـەش نموونەیەکـە ئەچەسپێ بەسەر هەموو میراتگراندا.

شەشەم : ئەگەر مرد ناشۆرێ و کفن ناکرێ و نوێـژی لەسەر ناکرێ و لەگەڵ موسڵماناندا نانێژرێ . ئەی باشـە چی لێ دەکـەین ؟ دەری دەکـەین بـەرەو بیابانێك و چـاڵی بۆ هەڵدەکەنین و بە جلەکانیەوە لـەوێ دەینێژیـن ، لەبەر ئەوەی رێزی نی‌یە ، وەلە سەر ئەمەشەوە حەڵاڵ نی‌یە بۆ کەسێك کە مردوویەکی لـەلادا مـرد و ئـەیزانی کـە نوێـژ نەکەر بووە کە بیهێنێ بۆ موسـڵمانان تـانوێژی لەسـەر بکەن.

حەوتـــەم : ئـەم کەســە لــە ڕۆژی دوایــی دا لەگــەڵ فیرعـەون و هامـان و قـارون و ئوبـەی کـوڕی خەلـەف دا حەشر دەکرێت کە پێشەوای کافران بون ـ پـەنا بـەخوا ـ وەناچێتـە بەهەشـتەوە و حـەڵاڵ نی‌یـە بـۆ هیـچ کەسـێك

لەكەسووكاری كە بۆی بپارێنەوە بەبەزەیی و لێ خۆشبوون، لەبەر ئەوەی كافرەو موستەحەقی نی یە بەپێی ووتەی خوای گەورە : ﴿ماكان للنبي والذين آمنوا أن يستغفروا للمشركين ولوكانوا أولي قربى من بعد ماتبين لهم أنهم أصحاب الجحيم﴾ (التوبة)

كەواتە براكانم مەسەلەكە یەكجار ترسناكە ، وەبەداخەوە هەندێك لەخەڵكی بەبچووكی تەماشای ئەمە دەكەن و كەسێك لەماڵەكەدا جێ دەكەنەوە كە نوێژ ناكات و ئەمەش دروست نی یە .

ئەمە حوكمی ئەو كەسەیە كە نوێژ تەرك دەكات ئەگەر پیاو بێت یان ئافرەت، ئەی ئەو كەسەی نوێژت واز لێ هێناوە : یان كەمتەرخەمیت كردووە تیایدا ، فریای ئەو تەمەنەت بكەوە كە ماوتە بەكردەوەی چاك . بەراستی نازانی چەندی تر لە تەمەنت ماوە ، ئایا چەند مانگێك یان چەند ڕۆژێ یان چەند سەعاتێك ، عیلمی لای خوایە و هەردەم وتەی خوای گەورەت بیر بێت كە دەفەرموێ : ﴿أنه من يأت ربه مجرما فإن له جهنم لايموت

فیها ولا یحییٰ﴾ (طه :٧٤) ﴿ فاما من طغیٰ وآثر الحیاة الدنیا فإن الجحیم هي المأویٰ﴾ (النازعات ).

خوا موەفەقمان بكات بۆ هەموو خێرو ڕزگار بونیٛ: و خوای گەورە ڕۆژانی تەمەنت خۆش بەخت وكامەران كات لەژێر سێبەری بەرنامەكەی خۆیدا بەعیلم و كردەوە و بانگەواز ... واللە أعلم...

## تێبینی‌یەكی گرنگ

بەلای هەندێك لە زانایانەوە وایە كەوا( نوێژ نەكەر ) كافر نابێ و لە بازنەی ئیسلام دەرناچێ و حوكمی هەڵگەڕاوە ( مُرتَد)ی بەسەردا نادرێت هەتا بەدڵ ئینكاری واجبێتی نوێژ دەكات و بەدرۆی دەخاتەوەو بێ بڕوا دەبێت پێی ، بەڵام ئەم قسەیە بەلای زۆرێك لە زانایانی سەلەفەوە ڕەت دراوەتەوە بەپێی زۆرێك لە (بەڵگەو ئیجماع) كە بە كورتی باسی دەكەین تا ئەو كەمە تەمەی هەیەو دروست كراوە ڕۆشن بێتەوە :-

١)پاش ئەو هەموو دەقە ڕاستەوخۆیانەی لە (فەرموودەی صەحیحدا) هاتووە ، هاوەڵانیش ئەم كارەیان ( واتە نوێژ نەكردن ) بە كوفر داناوە ، ( عبدالله

ی كوڕی شقیق العقیلی ) (رحمه الله )دەفەرموێت :
( هاوەڵەكانی پێغەمبەر ﷺ نەكردن و وازهێنان لە هیچ كارێكیان بە كوفر دانەدەنا جگە لە نوێژ ) (صحیح الترغیب والترهیب ( ٥٧٠) وقال الترمذي : اسناده حسن ) (وە ئەبو هورەیرەش ﷺ هەمان قسەی فەرمووە ) ( قال عبدالعزیز بن محمد ان هذا الاثر اخرجه الحاكم ( ٧/١ ) و قال الذهبي : اسناده صالح )٠

وە مادام بێ عوزر نەبێت وازهێنان لەیەك نوێژیش بە ئەنقەست هەتا كاتەكەی دەڕوات كوفرە و پێویستە تەوبەی لێ بكرێت ، ( محمدی كوڕی نصری المروزی ) دەفەرموێت : ( بیستم لە اسحاق ی كوڕی راهویە)ی پێشەوای ناودار كە دەیفەرموو : ( لە پێغەمبەرەوە ﷺ بە صحیحی هاتووە كەوا نوێژ نەكەر كافرە ، هەر بەم جۆرەش ڕای ئەهلی ( عیلم ) دوای پێغەمبەر ﷺ وابووە كەوا ئەو كەسەی واز لە نوێژ دێنێ بە ئەنقەست و بێ عوزر هەتا كاتەكەی بەسەر دەچێت كافرە ) (صحیح الترغیب و الترهیب ( ٢٣٠ ) )٠

٢) ئینكاری كردنی هەر واجبێك لە واجبەكان بە گشتی ( با كەسەكە بە كردەوەش ئەنجامی بدات )

کوفره ، وه ئەمەش تایبەت نی‌یە بە نوێژەوه و بەس ، ئەگەر مەبەست پێی ئینکاری کردنی بوایە ئەوا( نوێژ ) تایبەت نەدەکرا بە کافر بوونی ئەو کەسەی وازی لێ دێنێ ، پاشان ئینکاری کردن مەرج نی‌یە بۆ کوفر هەروەك لە حوکمی جنێودان بە خواو پێغەمبەر ﷺ دا بە ئاشکرایی دەردەکەوێت • وه ئەم قسەیەش کە دەوترێ .. دەبێ بە دڵ ئینکاری واجبێتی نوێژ بکات ئەوجا کافر دەبێت زیاتر( مورجیئە ) گومڕاکان دەیکەن و ئەوان بڵاویان کردەوە کە پێیان وایە : (ئیمان بریتی‌یە لە بڕوابوون لەدڵداو وتن بە زوبان ئیتر کردار مەرج نی‌یە بۆ ئیمان بەڵکو بۆ تەواوێتی ئیمانە !! کە ئەمەش زۆر کەسی لە خشتە بردووە )•

شێخی ئیسلام ( ابن تیمیە )(رحمە اللە )دەفەرموێت : زانراوه کەوا پشت کردن ( التولی ) بریتی‌یە لە بە درۆخستنەوە ( التكذیب ) بەڵکو ( التولی ) مەبەست پێی پشت کردنە لە تاعەت ، چونکە لەسەر خەڵکی پێویستە کەوا پێغەمبەر ﷺ بەڕاست دابنێن و بڕوای پێ بهێنن لەو شتانەی کە هەواڵی پێداوە و پێویستە

گوێڕایەڵی فەرمانەكانی بن ، وە پێچەوانەی بە ڕاست دانان ( التصدیق ) بریتی یە لە بە دۆرخستنەوە ( التكذیب ) وە دژی گوێڕایەڵی ( الطاعة ) بریتی یە لە پشت تێكردن ( التولی ) بۆیە خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فلا صَدّقَ وَلاَ صَلّى وَ لـكِنْ كَـذّبَ وَ تَولّـى ﴾ وە دەفەرموێت ﴿ وَ يَقولونَ آمَنّـا بِـالله وَ بِالرّسولِ وَ أطَعنـا ثُمّ يَتَولّـى فَريـقٌ مِنهُمْ مِن بَعْدِ ذلكَ وَ مـا أولئكَ بِـالمؤمنينَ ﴾ كە لێرەدا نەفی ئیمان دەكات لەو كەسەی كە پشت هەڵدەكات لە ئەنجامدانی كردەوەی چاك ئەگەر چی بە ووتەش بیڵێ (الفتاوی ( ١٤٢/٧ ) ، الایمان ( ١٢٧ . ١٢٨) ) .

بەڵام جیاوازی هەیە لە نێوان پشت هەڵكردنی تەواو و ڕەهاو ڕەهای پشت هەڵكردن چونكە ( یەكەم )كافر بوونە وەك وازهێنان لە خودی كردارەكە وەك نوێژ و ڕۆژوو .. و (دووەم) لە ئیمان كەم دەكات .

٣)پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ﴿ مَنْ تَرَكَ صَلاةَ العَصرِ فَقَدْ حَبطَ عَمَلُه ﴾ (رواه البخاري )، واتە : ( هەر كەسێك وازی لە كردنی نوێژی عەسر هێنا كردەوەكانی هەڵدەوەشێنەوە ) ، وە دەفەرموێتﷺ : ﴿ مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمُعاتٍ مِنْ غَيرِ عُذرٍ كُتِبَ مِنَ المُنافِقينَ ﴾ (صحیح الترغیب

والترهيب (٧٣١ )) وفي رواية : ﴿ ...فَقَدْ نَبَذَ الاسلامَ وراءَ ظهرِه ﴾ (صحيح الترغيب والترهيب )( ٧٣٥ ) •واتـه :( هەر كەسێك سێ جومعە بەبێ عوزر بفەوتێنێ لە دوو ڕووەكان دەنوسرێ ، يان ئيسلامەتی لە پشتی‌يەوە فڕێداوە ) •

وه دەفەرموێت ﷺ : ﴿ مَنْ أدركَهُ الأذانُ في المَسجِدِ ثُمَّ خَرَجَ لَم يَخرُج لِحاجةٍ وَهوَ لايُريدُ الرَّجعَةَ فَهُوَ مُنافق ﴾ (صحيح الترغيب والترهيب ( ٢٥٩ )) •

واتـه : ( هەر كەسێك لە مزگەوتدا بێت كە بانگ دەدرێت بۆ نوێژ و پاشان لە مزگەوت دەرچێتە دەرەوە و كاری پێويستی نەبێ‌و مەبەستی گەڕانەوەی نەبێت ئەوە دوو ڕووە ) •

وه ابن عمر ﷺ دەفەرموێت : ( كُنّا اذا فَقدنا الرّجل في الفَجرِ والعِشاءِ أسأنا بِهِ الظَّنّ ) (صحيح الترغيب والترهيب ( ٤١٤)) اي ظننا به النفاق ، واتـه : ( ئێمەی هاوەڵان ئەگەر پياوێكمان بزانيايە كە نايەت بۆ نوێژی بەيانی و عيشا بە جەماعەت گومانی دوو ڕوويمان پێ دەبرد ) •

دەسا برای خۆم ! كەسێك نوێژی عەسر بفەوتێنێ كردەوەكانی پوچەڵ ببنەوە و بە فەوتاندنی نوێژی جومعەی سێ جومعە بەبێ عوزر بە مونافیق حساب بكرێت و ئیسلامەتی لە پشتی‌یەوە فڕێ دابێت و مۆری دوو ڕوویی بدرێت لەدڵی‌و كەسێك كاتی بانگ لە مزگەوت دەرچێتە دەرەوە بەبێ هۆ مونافیق بێت و تەمبەڵی كردن لە نوێژی جەماعەتی بەیانی‌وعیشادا ببێتە هۆی تاوانباركردنت بە مونافقێتی ، ئاخۆ دەبێت حاڵی ئەو كەسە چۆن بێت كە لە تەمەنی‌دا نوێژێكی نەكردووە و سەجدەیەكی بۆ خوای گەورە نەبردووە ، بێ گومان ئەو كەسە كافرترو مونافیق ترو هەڵگەراوە ترە لە دین ئەگەر چی بە زوبانی بانگەشەی غەیری ئەمە بكات ، چونكە بەر زۆر فەرمووده دەكەوێت لەوانە :-

١ـ ﴿ ليس بين العبد و بين الكفر الأ ترك الصلاة ﴾

(رواه النسائي و غيره ، صحيح الترغيب والترهيب (٥٦٢) ٠)

٢ـ﴿ بين الكفر والايمان ترك الصلاة ﴾ ( رواه الترمذي ، هەمان سەرچاوە )٠

٣. ﴿ العهد الذي بيننا و بينهم الصلاة فمن تركها فقد كفر ﴾ (رواه احمد و ابو داود والنسائي والترمذي و غيرهم ، صحيح الترغيب ( ٥٦٤) ) •

٤. ﴿ بين العبد و بين الكفر والايمان الصلاة ، فاذا تركها فقد أشرك ﴾ ( رواه الطبري ، صحيح الترغيب (٥٦٥) )، دیاره ئەم شیرکەش بریتی‌یە لە شیرکی گەورە •

٤)لەبەر ئەو بەڵگەو ئیجماعانەی سەرەوە و بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە گوێ بگرە لە شێخی ئیسلام ( ابن تیمیه ) (رحمه الله ) دەفەرموێت : ( و أكثر السلف على أنه يقتل كافراً و هذا كله مع الاقرار بوجوبها ) ( الفتاوي ( ٢٨ / ٣٠٨ ) •

واتە : ( زۆربەی سەلەف لەسەر ئەو ڕایەن كەوا ( نوێژنەكەر ) بەبێ بڕوایی دەكوژرێ ، ئەمە لەگەڵ ئەوەشدا كەدان بنێ بە واجبێتی‌یەكەی‌دا ) •



وه دەفەرموێت : ﴿ متى امتنـع الرجل من الصلاة حتى يقتل لم يكن في الباطن مقراً بوجوبها ، ولا ملتزماً بفعلـها ، و هذا كافر باتفاق المسلمين ، كما استفاضت الآثار عن الصحابة بكفر هذا و دلّت عليه النصوص الصحيحة ﴾ الفتاوي ( ٢٢/ ٤٨ ) ٠

واتـه : ( هـەر کاتێك کەسێك وازی لـه نوێـژ هێنـاو نەگەڕایەوه و ملی‌نەدا تا وای لـێ هات بکوژرێ ئەوا لـه ناخی‌دا بڕوای به واجبێتی‌یەکەی نەبووه و بە کرداریش نـەیکردووه و ئـەم کەسـەش کـافره بـه یـەکدەنگی موسـڵمانان هـەروەکو بەڵگـەی زۆریـش لـه هاوەڵانـەوه هـاتووه لەسـەر کـافرێتی ئـەم کەسـانەو دەقـی بەڵگـەی صەحیحیش ئاماژەی بۆ دەکات وه ابن حزم ( رحمه الله ) هەمان ڕای هەیه /المحلى ( ٢/١٥٢ ) ٠

فەتواکـەی مامۆسـتای کـۆچ کـردوو ( محمـد نـاصرالدين الالبـاني ) زۆر کـەس اسـتغلالی ئـەو فەتوایـه دەکـات کـه مامۆسـتای فـەرمووده نـاس باسـی دەکـات سەبارەت به کافر نەبونی نوێژنەکەر ، ئێمه لەگەڵ ڕێـز و گەورە نرخـاندنی مـاندوو بوونـی ئـەو کەڵـه پیـاوه کـەم

وێنەیەی سەدەی بیستەم و زیندووكەرەوەی فەرموودە صەحیحەكان و دانەری چەندەها كتێبی جۆراو جۆر ، لەگەڵ ئەوەدا خۆشمان دەوێت لەبەر خوا بەڵام ئەم خۆشوسیتنە وامان لێ ناكات دەمارگیر بین بەرامبەری و هەق و بەتاڵی لێ وەربگرین و دیارە هەموو كەسێكیش شایستەی هەڵەیە ، فەرموون دەقی فەتواكەو وەڵام لەسەری :عن حذیفه بن الیمان ( رضي الله عنه) قال : قال رسول الله ﷺ ﴿ یَدرُسُ الاسلام كما یَدرُسُ وشْيُ الثوب حتى لا یُدری ما صیام ، ولا صلاة ، ولا نُسك ، ولا صدقة ، ویسری على كتاب الله عز وجل في لیلة فلا یبقى في الارض منه آیة ، وتبقى طوائف من الناس : الشیَخ الكبیر والعجوز یقولون أدركنا أباءنا على هذه الكلمة : ( لا اله الا الله ) فنحن نقولها ﴾ .

واتە : ( ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە هەروەك چۆن دەزولەی پۆشاك هەڵدەوەشێتەوە ، بەجۆرێ خەڵكی وای لێ دێت نازانێ ڕۆژو و نوێژ و قوربانی و سەربڕین و خێر كردن چی‌یە ، وەخەڵكی ئێوارە دەكاتەوە لەسەر قورئانەكەی خوای گەورە و ئەو شەوە یەك ئایەتی لەسەر زەوی‌دا نامێنێ و هەڵدەگیرێتەوە ، وە چەند كۆمەڵێك لە خەڵكی دەمێننەوە ، پیاو و ژنی پیر و پەك

کەوتــە دەڵێــن: ئــەم ووشـــەیەمان لــە باوباپیرانمانـــەوە بیســـتوە و پــێگەیشتوە ( لا الــــە الا الله ) و ئێمــەش دەیڵێین )).

شێخی ئەلبانی ( رحمە الله ) لە تــەعلیقی دا لەسـەر ئــەم فـــەرموودە صەحیحــە لــە کتێبــە بــە پێزەکــەیدا ( سلسلة الاحادیث الصحیحة ) (١/١٣٠ـ ١٣٢)دەفـەرموێ : ( لـەم فەرمودەیـەدا سـودێکی فیقــهی گرنگــی تێدایــە ، ئەویش ئەوەیە کەوا شایەتی دانی( لا اله الا الله ) ئەبێتـە هــۆی ڕزگــار کردنــی ئــەو کەســەی کــە ووتویــەتی لــە مانــەوەی بــە نــەمری لــەناو ئــاگری دۆزەخ دا لــە ڕۆژی دوایـدا ئەگـەر چی هیـچ کردەوەیـەکی ئەنجام نـەدەدا لـە پێنج پایەکەی تری ئیسلام وەکو نوێژ و غەیری ئەمە .(*)

(*) ئەمەش هەڵەیەکی ترە ئەگەر بیفەرموایە : ( لەپایـەکانی تـری ئیسلام وەکو نوێژ .. )باشتر بوو ، چونکە یەکەم پایـەو کۆڵەکـە شـایەتمانە هـەر کەسـێك وازی لــێ بـهێنێ بەیـەکدەنگی کـافرە ، کەواتـە ووشـەی ( .. لەپێنج پایەکـەی تـری ئیسـلام ) ڕسـتەیەکی هەڵەیە .. خوا لـێی خۆش بێت .

وە دیارە ئاشکراشـە کـەوا زانایـان جیاوازیـان هەیـە لەو حوکمـی نویـژ نەکـەر بەتایبـەتی ئەگـەر ئیمـانی بـە مەشروعیەتەکەی هـەبێت ، وەجمهور لەسـەر ئـەو ڕایـەن کەوا بەمە کافر نابێت بەڵکو فاسق دەبێت ، وە( ئیمامی ئەحمد ) وەك باس دەکەن لێوەی لەسـەر ئەوەیـە کـەوا کافر دەبێت پـێ ی و بەمورتـەدی دەکوژرێ نـەك بەحـەد ، وەبە صەحیحی لە هاوەڵانەوە هـاتووە کـەوا وازهێنـان لـە هیـچ کردەوەیـەکیان بـەکوفر دانـەدەنا جگـە لـە نویـژ . ( رواه الترمذي والحاكم ). وەمن پێم وایە کەوا ڕاست ووتـەی جمهورە ، وە ئەوەی کە لە هاوەڵەکانەوە هاتووە دەقێك نی‌یە کەوا مەبەستیان پـێ ی ( کوفر) ئـەو کوفـرە بێـت کـەوا خاوەنەکـەی بەنـەمری لـە ئـاگردا دەمێنێتـەوە و گریمان ئەوەی لـێ ناکرێ خوای گەورە لـێ ی خۆش بێـت ، چۆن وا دەبـێ لە کاتێکدا ( حوزەیفـەی کوڕی یـەمان ) کەلە گەورە هاوەڵەکانـە ـ ڕەدی ( صلـة ی کـوڕی زفـر ) دەداتـەوە کاتـێ خەریکـە وەلە تێگەیشـتنی ( ئیمـامی ئەحمـەد) تـێ ی بگـاو دەفـەرموێت: ( لا الـه الا الله )

سودی چی‌یان پێ دەگەیەنێت ، خۆ ئەوان نازانن نوێژ چی‌یە .. ؟ حوزەیفەش وەڵامی دەداتەوە دوای ئەوەی پشتی تێ دەکات : {ئەی (صلة) ڕزگاریان دەکات لە ئاگر } سێ‌جار ، ئەمە دەقێکە لە حوزەیفەوە ( رضي الله عنه ) لەسەر ئەوەی نوێژنەکەر ـ هەروەها پایەکانی تریش کافر نی‌یە بەڵکو موسڵمانە و ڕزگاری دەبێت لەبەنەمری مانەوە لەئاگری دۆزەخدا لە ڕۆژی دوایی ، سا ئەمە لەبەر بکە چونکە لەوە ناچێ لە غەیری ئێرەدا دەستت بکەوێت و بیدۆزیتەوە ) { حکم تارك الصلاة ص(٧١)ی شیخ الالبانی پێشەکی دانان و بەچاپ گەیاندنی لەلایەن ( علي الحلبي )} یەوەیە.

دیارە ئەم فەرموودەیە ئاوا ڕاڤە ناکرێت و پێشتر شێخی تر قسەی لەسەر کردووە ئەوەتا شێخی ئیسلام : ابن تیمیة ( رحمه الله ) دەفەرموێت :{ زۆر کەس هەیە لەناو شوێن و کاتێك دا پێ دەگات کە زۆر زانستی پێغەمبەرایەتی تێدا هەڵوەشاوە بەجۆرێ کەسێك نەماوە

